ڕێکخراوی دۆستانی هەڵەبجە کتێبی ژمارە (٨)





# دیوانی
# تاهیربەگی جاف

کۆکردنەوە، ئامادەکردن و ساغکردنەوەی
موحەممەدڕەشیدی ئەمینی پاوەیی
کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)
جووتیار نەریمان



# دیوانی
# تاهیربەگی جاف

کۆکردنەوە، ئامادەکردن و ساغکردنەوەی

موحەممەدڕەشیدی ئەمینی پاوەیی
کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)
جووتیار نەریمان

٢٠٢١

## ناسنامەی کتێب

- **ناوی کتێب:** دیوانی تاهیربەگی جاف
- **کۆکردنەوە، ئامادەکردن و ساغکردنەوەی:**

موحەممەدڕەشیدی ئەمینی پاوەیی
کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)
جووتیار نەریمان

- **بەرگ:** ڕەوشت موحەممەد
- **دیزایینی ناوەوە:** عەبدوڵلا حەبیبی
- **تایپ:** ئامادەکار
- **تیراژ:** (٧٥٠) دانە
- **نرخ:** (٦٠٠٠) دینارە
- **چاپ:** چاپی یەکەم ٢٠٢١

لە بەڕێوبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٠٤٣)ی ساڵی ٢٠٢١ی پێ دراوە.

بە سپۆنسەری بەڕێز پارێزگاری سلێمانی (د. هەڤاڵ ئەبووبەکر) چاپ کراوە

## پێرست

# پێشەکی

دیـوانی تـاهیربەگی جـاف بـۆ یەکـەمین جـار لـە سـاڵانی ١٩٣٥ و ١٩٣٧ لەسـەر نەفەقەی موحەممەد ئەمین عەسری کە خاوەنی کتێبخانەی مەعاریف بوو لە کەرکـووک، چاپ کراوە. ساڵی ١٩٥٧ دووبارە چاپ کراوەتەوە. دواتر حەمید موستەعان، جارێکی تـر بە دیوانەکەدا دەچێتەوە و چاپی یەکەمی لە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی لە شـاری سـنە بـڵاو کردووەتەوە. دوای ئەم چاپە، حەسەن گۆران بە پێداچوونەوە و زیـادکردنێکی کەمـەوە چـاپی یەکەمی لە ساڵی١٣٨١ی هەتاوی و چاپی دووەمیشی لە ساڵی ٢٧١١ی کوردی لە شاری سنە بڵاو کردووەتەوە.

دوای ئەمانە لێکۆڵەرانی تر بە ناوەکانی کامیل سـەفەریان و زەهـرا سـەججادی، چـاپی یەکەمیان لە بڵاوگەی ئاراس لە سـاڵی ١٣٩٣ی هەتاویـدا چـاپ و بـڵاو کـردەوە. دوایـین چاپی دیوانی تاهیربەگی جاف لەلایەن نەجمەددین براخاسی (هەوار)ەوە چاپی یەکەمی لە بڵاوکراوەی مانگ، ساڵی ٢٠٢٠ی زایینی لە شاری بانە بڵاو کردەوە. ئـەم چاپانـەی دیـوانی تـاهیربەگی جـاف تـاکو ئێسـتا بـێ هەڵـە و کـەموکورتی نـەبوون و نـین و هیچکامیـان بە شێوەیەکی زانستیانە چاپ نەکراون. بەداخەوە هەموویان هەڵەیان زۆرە و شیعری ئـەم و ئەویان زۆر تێدایە و وردەکارییەکی ئەوتۆیان تێـدا نییـە. ئێمـە بـە باشـمان زانـی دیـوانی تـاهیربەگی جـاف بـە شـێوەیەکی زانسـتیانە و وردەکارییـەکی باشـەوە ئامـادەی چـاپ بکەینەوە.

ساڵی ٢٠١٣ نوسخەیەکی دیوانی تـاهیربەگی جـافم دەسـت کەوت، بە دەستنووسـی کەمالیی شاعیر کە بۆ ئەحمـەدموختار بـەگی جـافی نووسـیوەتەوە و بـۆ یەکـەمین جـار وتارێکم لەسەر نووسی و بڵاوم کردەوە. هەر لـە کنـین و پشـکنینی نوسـخە و بەڵگەنامـە بەردەوام بـووین، دواتـر مامۆسـتا موحەممـەد عـەلی قـەرداغی نوسـخەی دەستنووسـی مسوەددەی لە ٢٠١٥/١/٢٠دا پێشکەش کردم و هەندێک نوسخەی تـریش کـە لـەم لا و

لەولا هەبوون و لای بەڕێزی بوون، هەمووی پێ داین. هەر لەم نێوەندەدا هەردەوێڵ کاکەییش نوسخەیەکی کەشکۆڵی کفریی پێ دام و ئەویش بوو بە بنەمایەکی تر بۆ ساغکردنەوەی دیوانەکە. کتێبخانەکەی موحەممەدڕەشیدی ئەمینیی پاوەییش سەرچاوەیەکی تر بوو بۆ ئەم دیوانە و سوودمان لە دەستنووسەکانی وەرگرتووە. دواتر بەنێو هەموو دەستنووسەکانی لای خۆم و نوسخەکانی لای کاک عەبدوڵڵای حەبیبیشدا چووینەوە و هەستمان کرد شتگەلێکی تر هەن و کارەکە هێشتا زۆر بە بەریەوە ماوە.

ساڵی ٢٠١٦ مامۆستا قەرەداغی هەواڵی نوسخەیەکی تری دیوانی تاهیر بەگی پێداین و ئەویشمان دەست خست. تاکە سەرچاوەیەک کە لەم دواییانەدا بوویوو بە مەراقمان و خوێندن و دوورەوڵاتی و کورۆنا نەیدەهێشت دەستمان پێی بگات، دەستنووسی کەریم بەگی جاف بوو، ئەویش لەم دواییانەدا توانیم لە بەڕێز دوکتۆر حەسەن جافی وەرگرم. نیازم وایە کار بکەم بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم دەستنووسە.

دواکەوتنی ئەم دیوانە بە چەند هۆکارێک بووە، هەندێک لەو هۆکارانە بەهۆی دوورەوڵاتی و دەستنەگەیشتن بە چەند سەرچاوەیەک بووە، هەروەها پێنج جار شێوازی لێکۆڵینەوەی ئەم دیوانە گۆڕاوە، چونکە ئەم دەستنووسانە لە ماوە و کاتی جیاوازدا دەست دەکەوتن و دەبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هەندێک تێبینی و ڕاوبۆچوونی جیاواز، بۆیە تا دوایین جار ئەم شێوازەمان بۆی دەستنیشان کردووە کە لێرەدا ئاماژەی بۆ دەکەین.

سەرەتا ئەو شیعرانەی گومانیان لەسەر بوو، بە پاڵپشتیی سەرچاوەگەلی جیاواز ساغ کراونەتەوە و هەرچی شیعرێک لەنێو دوو دیواندا هاتبێت، ساغکراوەتەوە و هەر شیعرێک هی تاهیر بەگ نەبووبێت دەرهێنراوە، لەوانە: شیعری چاوی مەخمووریی نێوان تاهیر بەگ و ناری...

لەم دیوانەدا ڕەچاوی ئەوە کراوە شیعرەکان لە دەستنووسێک یان چەند دەستنووسێکەوە وەربگیرێت و تەواوترینیان بەسەرچاوە بکرێت و ئەوانی تر لە پەراوێزدا وشە بە وشە

نووسراون و بەراورد کراون و دەقێکی تەواومان لە نوسخەکان دروست کردووە. هەندێک شیعر کە لە نوسخەکاندا نەبووە و تەنیا لە دیوانەکاندا هەبووە، باشترینیان بەسەرچاوە کراوە و هەر هەڵە و کەموکورتییەکیشی تێدا بووبێت، بەپێی بیروبۆچوون و تێڕوانینی خۆمان بۆ دەقەکە و پەیبردنمان بۆ ڕاستییەکەی لەژێر ڕۆشنایی بەڵگەی ڕەوانبێژی، عەرووزی، زمانی و واتاییدا ڕاستمان کردووەتەوە و لە پەراوێزیشدا ئاماژەمان بۆ کردووە. هەندێک شیعریش هەر خۆیان لە نوسخەکاندا ناتەواوبوون و هیچ چارەیەکمان بۆ ساغکردنەوەیان نەدیتۆتەوە و هەروەکو خۆی هێشتوومانەتەوە. شیعر هەبووە لە دیوانەکەدا سەرچاوەکەی نووسرابوو، دەستمان بە سەرچاوە بنەڕەتییەکە گەیشتووە و سوودمان لەو وەرگرتووە. شیعریش هەبووە شاعیر خۆی بەناتەواوی نووسیویەتییەوە و تەواونەکراو بووە، هەم لەڕووی کێش و سەرواوە و هەم لەڕووی مانایشەوە ناتەواو بووە؛ ئێمە ئەگەر کێشەکەمان ڕێک بکردایەتەوە ماناکەی ناتەواو دەبوو، ماناکەیشمان ڕێک بکردایەتەوە، سەروا و کێشەکە ناتەواو دەبوو. بۆ ئەم کارە بیرمان لەوە کردەوە کە ئەم شیعرانە دەستکاری نەکرێن و وەکو خۆیان بمێننەوە و وەکو شیعرێکی تەواونەکراو دابنرێن تا لێکۆڵەرانی دواتر بتوانن سوود لە بیر و هزری تاهیر بەگ وەربگرن و بزانن شێوازی شیعرنووسینی تاهیر بەگ چۆن بووە. چەند شیعرێکیش لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانەوە وەرگیراون، ئەوانەیش بە هەمان شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە.

سەبارەت بە ژیان و بەرهەمەکانی شاعیریش سوودمان لەو دەستنووس و سەرچاوانە وەرگرتووە کە چاپ و بڵاو کراونەتەوە. هەندێک لە دەستنووسەکانیش بۆ یەکەمین جارە دەخرێنە ڕوو و بڵاو دەکرێنەوە. هەموو ئەوانە شەنوکەو و بەراوردمان کردوون و لێکمان داونەتەوە، دوای ئەوە ڕاوبۆچوونی خومان لەبارەیانەوە گوتووە.

لەبارەی پەیوەندیی نێوان مێجەر سۆن و تاهیر بەگیشەوە لە هەندێک لە سەرچاوەکاندا لێکۆڵینەوەی وردی بۆ کراوە و ئێمەیش تێبینی و بۆچوونی خۆمان لەو بارەیەوە خستووەتە

ڕوو.

سەبارەت بە دەستنووسەکانیش هەموویان بە وردی ناسێندراون و باسیان لێ کراوە، هێمایان بۆ دانراوە و وێنەیشیان لە کۆتاییی کتێبەکەدا هێنراوە.

ئەمە کورتەیەکە لەو کارانەی بۆ دیوانی تاهیربەگی جاف لە ماوەی حەوت ساڵدا بەجێمان گەیاندوون. کارەکە چەندین جار لێی کۆڵراوەتەوە و وردبینیی بۆ کراوە، چەندین جار ئەم شار و ئەو شاری بۆ کراوە، چەندین جار خوێنراوەتەوە و بەراورد کراوە. هەوڵمان داوە هەڵە بەسەرماندا تێ نەپەڕێت.

لێرەدا نابێت هەوڵی کاک عادل سدیق لە شاری هەڵەبجە و هەندێک دۆستی تر کە هەوڵی گردوکۆکردنی شیعر و سەرچاوەکانی ئەم دیوانەیان داوە لەبیر بکەین. ئەوەی ماوەتەوە ئەوەیە سپاسی هەندێک دۆست و برادەر بکەین کە لەماوەی ئەم حەوت هەشت ساڵەدا هاوکار و هاودەنگ و یارمەتیدەرمان بوون، پێمان خۆشە لێرەدا ناویان بهێنین: مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی، مامۆستا کۆچەر میرزا، عەبدوڵڵای حەبیبی، فائیزە قووچی، بوار نوورەددین، دوکتۆر ئاراس، مامۆستا ئەحمەد حوسێن، بنکەی ژین، کاک ئیسماعیل تەها، دوکتۆر حەسەن جاف و نەجاتی عەبدوڵڵا... هەموو ئەوانەیشی کە ناویانمان لەبیر چووە، سپاسی بێپایانیان دەکەین و دەستی ماندووبوونیان دەگوشین. هیواداریـن ئەم بەرهەمە جێی ڕەزامەندیی هەموو لایەک بێت و شایەنی کتێبخانەی کوردی بێت.

## ژياننامەی شاعير

سەبارەت بە ژياننامەی تاهيربەگی جاف، هەرچەندە مێژووەکەی زۆر کۆنيش نييە، بەڵام بەڵای زەمانە و داگيرکرانی کوردستان کاری خۆی بۆ لە ناوبردنی بەرهەم و ژيانی ئەم شاعيرەيش کردووە. ئێمە لەناو دەستنووس و بەڵگەنامەکاندا شتێکی تازەی ئەوتۆمان دەست نەکەوتووە، ئەوەی هەيە لەناو کتێب و ڕۆژنامە و يادداشت و چاپەکاندايە، ئەمانەيش زۆربەی زۆريان بە کەم و زيادەوە لە يەکترييەوە وەريان گرتووە؛ ئێمەيش ناچار بووين هەر ئەو سەرچاوانە لێک بدەين و لێکۆڵينەوەيان لەسەر بکەين.

### ناوی شاعير

سەبارەت بە ناوی شاعير، گومان لەوەدا نييە کە ناوی ڕاستەقينەی تاهيرە و کوڕی عوسمان (وەسمان پاشای جاف) بووە و بنەماڵەکەيان لە بەگزادەکانی جاف بوون؛ هەموو سەرچاوە مێژوويی و ئەدەبييەکان لەسەر ئەوە يەکدەنگن. عوسمان پاشا کوڕی موحەممەد پاشای کوڕی کەيخوسرەو بەگی کوڕی سلێمان بەگی کوڕی قادر بەگی کوڕی زاهير بەگی يارئەحمەد بەگی جافە... (مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٣٩٥: ٤٩٦) دوکتۆر حەسەن جافيش لەم بارەيەوە دەڵێت: وەسمان پاشای جاف، خاوەنی پێنج کوڕ "مەجيد بەگ، حەمەسەعيد بەگ، تاهير بەگ، عيزەت بەگ، ئەحمەدموختار جاف و دوو کچ ناهيدە خانم و سەبيحە خانم بووە"، مەجيد بەگ کە کوڕی گەورەی وەسمان پاشايە و حەمەسەعيد بەگ لە مەنيجە خانمی خێزانی يەکەمی وەسمان پاشايە کە لە بەگزادەکانی هەوراميية، تاهير بەگ و عيزەت بەگ و ئەحمەدموختار جاف و ناهيدە خانم و سەبيحە خانم لە عاديلە خانمی کچی عەبدولقادربەگی ساحێبقرانە. (ڕامان، ژ ٢٢٤، ٢٠١٦: ١٥٤) لە دەستنووسێکی لای مامۆستا موحەممەدڕەشيدی ئەمينی پاوەييشدا نووسراوە: طاهر بيگ عثمان پاشای جاف مرادی، ساکن حلبجه. (کەشکۆڵی

موحەممەد سەعید، ١٣٢٧: ١٣٨) سەبارەت بە هەندێک لە باوک و باپیرانی ئەم بنەماڵەیە ڕای جیاوازیان هەیە.

سەبارەت بە ناوی دایکیشی هەندێک لە نووسەران هاوڕان لەسەر ئەوەی ناوی عادیلە خانم بووە و هەندێکی تریش ڕای جیاوازیان هەیە. ئەوانەی ڕایان یەک بووە دەڵێن: عادیلە خانم لە بنەماڵەی ساحێبقرانەکانی سنە بووە... (مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٣٩٥: ٤٩٦) بەڵام بۆ ڕا جیاوازەکان، پێمان خۆشە سەرنجتان بۆ ئەو پێشەکییەی کاک فەرهاد شاکەلی ڕابکێشین کە بۆ کۆیەرهەمی ئەحمەدموختار جاف، لە کۆکردنەوە و ئامادەکردنی کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین) نووسیویەتی. کاک فەرهاد بە شێوەیەکی ورد لەو باسە دواوە. لێرەدا ئێمە خۆمان بەو باسەوە سەرقاڵ ناکەین و شتێکی لەو باشتریش ناخەینە بەر دید و بۆچوونتان.

هەر سەبارەت بە ناوی دایکی تاهیر بەگ، مێجەر سۆن بە هەڵەدا چووە و بەم شێوەیە باسی تاهیر بەگ و باوک و دایکی دەگێڕێتەوە: دەگەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، کاتێ خزمەتکارێک پێی وتم کە من دەبێ بڕۆم بۆ لای تاهیر بەگی دووەم کوڕی عوسمان پاشا لە ژنی یەکەمی. (مێجەر سۆن، ٢٠١٨: ٢٢٨ و ٢٣٣)

وەکو وتمان ئەوە ڕوونە دایکی تاهیر بەگ عادیلە خانم بووە، نەک خانمی یەکەمی وەسمان پاشا. سۆنیش ماوەیەکی زۆر لە ماڵی وەسمان پاشادا ماوەتەوە کەواتە چۆن ئەو هەڵەیەی کردووە؟ ئەگەر سەرەتا وای زانیبێت کە کوڕی ژنەکەی تریەتی و دواتر ئەوەی بۆ ڕاست بوویێتەوە چۆن ئەوەی ڕاست نەکردووەتەوە؟ ئەگەر بۆ شێواندنی مێژوو نەبوویێت بۆچی بووە؟ یان دەکرێت بپرسین ئەو شتە بەلای ئەوەوە گرنگ نەبووە کە کوڕی کامیان بوویێت، بەڵام ئەو سەرقاڵی نووسینەوەی ڕاپۆرتی نهێنییە و ئەو زانیارییانەیش نابێت بە هەڵە بڕواتە سەرەوە. دەستنووسەکەی لای مامۆستا موحەممەدڕەشیدی ئەمینی کە لە ساڵی ١٣٢٧=١٩٠٩ نووسراوە، دەڵێت تاهیر بەگ کوڕی وەسمان پاشای جافە و لە تیرەی

مورادییە و لە شاری هەڵەبجە نیشتەجێ بووە. لێرەدا دەتوانین بڵێین ناوی تاهیر بووە و کوڕی وەسمان پاشای جافی موورادیی بووە و دایکیشی ناوی عادیلە خانم بووە.

## ساڵی لەدایکبوون

بۆ ساڵی لەدایکبوونی شاعیریش، بە هەمان شێوە نووسەران و لێکۆڵەران و ڕۆژهەڵاتناسەکان بە هەندێک جیاوازییەوە ساڵی لەدایکبوونی تاهیر بەگیان لە یەکترییەوە وەرگرتووە.

هەریەک لە موحەممەدئەمین زەکی بەگ، مەحموود عەزیز حەسەن، حەمید موستەعان و نووسەری نامەی فەرهەنگیی کۆهستان، ساڵی لەدایکبوونی تاهیر بەگیان بە ساڵی ١٢٩٥ی کۆچیی مانگی داناوە و دەڵێن لە هەڵەبجە لەدایک بووە.[١] مەحموود عەزیز ساڵی ١٢٩٥ی کۆچیی بەرانبەر بە ساڵی ١٨٧٦ی زایینی داناوە.[٢]

هەریەک لە عەلائەددین سەججادی و حەسەن گۆران، ساڵی ١٨٧٥ی زایینییان داناوە.[٣] مارف خەزنەدار، کامیل سەفەریان و زەهرا سەججادییش ساڵی ١٨٧٨ی زایینییان بۆ ساڵی لەدایکبوونی تاهیر بەگ نووسیوە.[٤] هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە تاهیر بەگ لە شاری هەڵەبجە لەدایک بووە.

وەکو دەبینین سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی تاهیربەگی جاف، هەندێکیان ساڵی ١٢٩٥ی کۆچییان داناوە و هیچ سەرچاوەیەکیان بە دەستەوە نەداوە. کەمالیی شاعیر

---

١- کۆهستان، ژ٦٩، ١٣٢٥: ٥؛ سەرجەمی بەرهەمی موحەممەد...، ٢٠٠٥، ب١: ١٤٣؛ کورتەیەک لە مێژووی هۆزی جاف، ١٩٨٥: ٢٩؛ دیوان؛ حەمید موستەعان، ١٣٨٠: ٣-٤.

٢- کورتەیەک لە مێژووی هۆزی جاف و باسی هەندێک لە تیرەکانی، ١٩٨٥: ٢٩.

٣- مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٣٩٥: ٤٩٦؛ دیوان؛ حەسەن گۆران، ٢٧١١: ١٦.

٤- مێژووی ئەدەبی کوردی، ٢٠٠٤، ب٤: ٥٦٥؛ دیوان؛ کامل صفریان/ زهرا سجادی، ١٣٩٣: ٥.

کەسێک بووە لە بنەماڵەی شاعیرەوە نزیک بووە، دیوانە شیعرەکەی تاهیر بەگی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە. کەمالی دۆستی نزیکی ئەحمەد موختار جاف بووە، سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی تاهیر بەگ لە گوڵدەستەدا هیچ شتێکی وای بۆ تۆمار نەکردووین؛ تەنانەت ساڵی لەدایکبوونیشی نەنووسیوە. هەرچەند ئەو نووسینەی کەمالی کە لە کتێبەکەیدا هێناویەتی، هەمان ئەو نووسینەیە کە نەجمەددین مەلا لە کەشکۆڵی سۆزی نیشتماندا تۆماری کردووە، ئیتر نازانم ئەو زانیارینەدانەی لەبەر ئەوە بووە کە زانیاریی تازەی نەبووە یان نا. خۆ دەزانین ئەو لە زۆر کەسەوە نزیک بووە و بەتایبەتیش لە ئەحمەدموختارەوە چونکە کاتبی ناوبراو بووە و دەکرا زانیارییان لێ وەرگرێت. ئەمە بۆ ئێمە جێی تێڕامان و سەرسووڕمانە کە بۆچی زانیاریی نوێی لا نییە؟

هەر سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی شاعیر، لێکۆڵەران و ئەدیبان هەندێکیان ساڵی زایینییان بۆ داناوە، ئەو ساڵانەیش کە دانراون ساڵەکانی ١٨٧٥، ١٨٧٦ و ١٨٧٨ی زایینین کە بەرانبەر بە ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی ئەژمار کراون. لەبەرئەوەی ڕۆژ و مانگی ئەو ساڵە کۆچییە لە سەرچاوەکاندا دانەنراوە، حەق بە لێکۆڵەران دەدەین کە بەو جۆرە ناکۆکییان کەوتووەتە نێوانەوە، بەڵام دەبوو ئاماژەیان بەوە بدایە ئەو ساڵە بەرانبەر بە فڵانە ساڵی کۆچییە بەو شێوەیە دەکاتە ئەم ژمارەیە. ڕاستییەک هەیە دەبێت ڕوونی بکەینەوە؛ ئەگەر تاهیربەگی جاف لە ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی لەدایک بووبێت، ئەوا ڕێکەوتە کۆچییەکە بەرانبەر بە ساڵە زایینییەکە بەم شێوەیە دەبێت (١/١/١٢٩٥ک.) دەکاتە (٥/١/١٨٧٨ز.) و ڕێکەوتی (٢٩/١٢/١٢٩٥ک.) دەکاتە (٢٤/١٢/١٨٧٨ز.). بەم پێیە ڕۆژ و مانگەکانی ساڵی ١٢٩٥ ناکەوێتە ناو ساڵەکان ١٨٧٥ و ١٨٧٦ و ١٨٧٧ زایینییەوە و لەناو ساڵی ١٨٧٨ی زایینیی دایە. ئەم ڕێکەوتە بەرانبەر بە ڕێکەوتی زایینی، چوار ڕۆژ پێشترە.

بۆیە ئێمە بڕوامان وایە ئەگەر تاهیربەگی شاعیر ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی لەدایک

بوویێت، ئەوا بەرانبەر بە ساڵی ١٨٧٨ی زایینیی دەکات نەک ساڵەکانی تر. لێرەدا پێویستە درێژە بە لێکۆڵینەوەکە بدەین و هەندێک قسەوباس هەیە ڕوون بکرێتەوە. عەلائەددین سەججادی دەڵێت لە تەمەنی ٤٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، نەجمەددین مەلایش لە دەستنووسی سۆزی نیشتماندا دەڵێت ٤٤ ساڵ ژیاوە [هیچ ساڵکی بۆ لەدایکبوون و مردنی نەنووسیوە]. سەججادی ساڵی ١٨٧٥ی زایینی بۆ لەدایکبوونی داناوە، بەڵام سەرچاوەکانی تر دەڵێن لە ١٨٧٦ و ١٨٧٨ی زایینی لەدایک بووە و بۆ مردنیشی ساڵی جیاوازیان بۆ داناوە. لە نوسخەی بنەماڵەی حەسەن فەهمی بەگیشدا لاپەڕەیەک هەیە باسی مردنی شاعیر دەکات و دەڵێت: تاهیر بەگ لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ی زایینیی مردووە، کەواتە ٤٢ و ٤٤ ساڵ بۆ تەمەنی تاهیر بەگ هەڵەیە. هەروەکو وتمان ساڵی ١٢٩٥ی کۆچیی بەرانبەر بە ١٨٧٨ی زایینیی دەکات و تەنیا یەک ڕۆژ لە ڕۆژەکان جیاوازیی هەیە و هیچ ڕێگەیەکی تێدا نییە بڵێین کە بەپێی ڕۆژ و مانگەکان لەوانەیە ساڵەکە بگۆڕێت، بۆیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ساڵە کۆچییەکە بەرانبەر بە چ ساڵێکی زایینییە و ئەو ساڵە زایینییانەیشی بە ١٨٧٥ و ١٨٧٦ دانراوە هەڵەیە و شاعیریش لە ٤٢ ساڵیدا نەمردووە.

ماجید خەلیل فەتتاح دەڵێت: عەبدولقادر بەگی ساحێبقران، کیژەکەی خۆی بەناوی عادیلە کە ساڵی ١٨٥٩ لە شاری سنە لەدایک بووە، لە تەمەنی ٣٦ ساڵیدا دەداتە وەسمان پاشای جاف لە شاری هەڵەبجە. (دیداری نێودەوڵەتی عادیلە خانم، ٢٠١٩: ٣٠ - ٣١) ئەگەر عادیلە خانم لە تەمەنی ٣٦ ساڵیدا شووی کردبێت بە وەسمان پاشای جاف، واتە لە ساڵی ١٨٩٥ی زایینیی شووی کردووە و دەبێت لە ساڵی ١٨٩٦ی زایینیی تاهیر بەگی بوویێت، بەم پێیەیش هەموو ئەو ساڵانەی بۆ لەدایکبوونی تاهیر بەگ دانراوە، هەڵە دەردەچێت و ڕەدی دەکاتەوە. ئەگەر عادیلە خانم لە ١٨٧٧دا شووی بە وەسمان پاشا

کردبێت، ئەوکاتە تەمەنی عادیلە خانم ١٦-١٩ ساڵ بووە و تاهیر بەگیش یەکەم نەوەی عادیلە خانم بووە، ئەوا تاهیر بەگ ڕاستە لە ساڵی ١٨٧٨ی زایینیدا لەدایک بووە، ئەگەریش لە ساڵی ١٩١٨دا مردبێت، ئەوا تاهیر بەگ ٤٠ ساڵ ژیاوە. بۆ ڕاستیی ئەم بابەتەیش چەند بەڵگەیەکی تر لە بەردەستدان، لەوانە: کاتێک موحەممەد پاشای جاف لە لایەن کەرەمویسییەکانەوە لە ساڵی ١٨٨١ یان ١٨٨٢دا کوژراوە و وەسمان پاشایش بەم کوژرانە زۆر دڵگران بووە و ماوەیەک خۆی نەشۆردووە و خۆی نەگۆڕیوە و عادیلە خانمیش لەوکاتەدا زۆر داوای لێکردووە کە بەو شێوەیە نەبێت... (حەسەن فەهمی بەگ: س. پ، ل٤٢؛ موحەممەد ئەمین زەکی بەگ: س. پ، ل١٢٣؛ کەریم بەگی فەتتاح بەگی جاف: تەئریخی جاف، ل٨٥) کاک عادل سدیق چەندین بەڵگەی تر بە لێکۆڵینەوەوە دەخاتە ڕوو کە عادیلە خانم لە تەمەنی لاویدا شووی بە وەسمان پاشا کردووە نەک لە تەمەنی ٣٦ ساڵیدا. (دیداری نێودەوڵەتی عادیلە خانم، ٢٠١٩: ٥٦) ئێمەیش بڕوامان وایە کە عادیلە خانم لە تەمەنی ١٦-١٩ ساڵیدا شووی بە وەسمان پاشا کردووە، چونکە بەو پێیە زۆر جێی باوەڕترە و ساڵی لەدایکبوونی تاهیر بەگیش دروستتر دەردەچێت. هەر لە دەستنووسی مەحموود پاشای جافیشدا بە خەتێکی تازە و ڕێنووسی تازە، لە بابەت لەدایکبوونی تاهیر بەگەوە نووسراوە: «فرهی ٢٩٥» تەئریخی ولادەتی تاهیر بەگی عوسمان پاشایە بە ئیزافەی هەزار، یەعنی ١٢٩٥. (کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف، ٢٠١٤، ب١: ٦٧) ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە بۆ ئەو ساڵەی دایان ناوە، بڕوامان وایە لە ساڵی (١٢٩٥ک.) بەرانبەر (١٨٧٨ز.) لەدایک بووە.

شاکر فەتتاحیش لەبابەت ژیانی تاهیر بەگەوە هەندێک شتی بۆ یادداشت کردووین و دەڵێت: لەپڕ کوڕێکی ١٦ ساڵەی قەد و باڵا جوانی پەری ڕوو هاتە ژوورێ. دەستی گوشین. ئێمەیش جگەرەمان دایە. پرسیم کێیە؟ خۆی وتی: «من مەسعوودی کوڕی تاهیر بەگ»م. بە ڕاستی دڵم ڕۆشن بووەوە. گەلێ قسەی خۆشخۆشی بۆ کردین. تەرحە

پێکەنینێکی هەبوو، کاری لە دڵی پیاو ئـەکرد. سەرگوروشـتـەی خـۆی بـۆ گێڕامـەوە، کـە بۆچی لە خوێندنگا وازی هێنا. بەڵام لە دواییدا تێگەیشتم کە سەرەواوێکی لە سکا نییـە. هەر لەم لاو ئـەولا ئەسـووڕێتەوە. مـنـیش ئـاخێکم هەڵکێشـا و لـە دڵـی خۆمـدا گـوتم: «داخەکەم تاهیربەگی ناودار کەسێ نەبوو جێگای بگرێتەوە!». ئەگەر ئـەم کـوڕە بـاوک و دایکی بمایە وازیان لێ نەئەهێنا تـا پیـاوێکی نـاوازەی وەک بـاوکی خـۆی لـێ ئەهاتـەوە دەرەوە. وا دیارە ئەحمەدبـەگی مـامی هـیچ ئـەوەی لێـک نەداوەتـەوە...!؟ یـاخود لێکـی داوەتەوە بـەڵام بـۆی نەچۆتـە سـەر...! لەگـەڵ ئەوەیشـدا مەسـعوود بـەگ هـاودەمێکی زۆرباشی نواند. لەگەڵ حەمەفەرەجدا هەموو جارێ لەگەڵماندا ئەهاتە دەرەوە، ئەی گێڕاین بەناو شاردا. (گەشتی هەڵەبجە و هەورامان لە ساڵی ۱۹۳۳دا، ۱۹۷۳: ۱۳-۱٤)

**خوێندن و بەرهەمەکانی**

وەکو لە سەرچاوە دەستنووسی و چاپەکاندا هاتووە، تاهیر بەگ خوێندنی زۆری نەبووە و لە خوێندنگای حوکوومیدا نەیخوێندووە. وەکو گوتمان ئەو سەرچاوانەیش زۆربـەی زۆریـان لە یەکەوە وەریان گرتووە. ئێمەیش هەر لەبەر ڕۆشناییی ئەو سەرچاوانەی بەردەسـتمان لـەم باسەمان کۆڵیوەتەوە.

لە نامەی فەرهەنگیی کۆهستاندا نووسراوە: تەحسیلاتی تاهیر بەگ زۆر نەبووە، ئەما خودا زەوقی شیعر و تێگەیشتنێکی چاکی پێ داوە... (کوهسـتان، ۱۳۲۵: ٦۹) لـە سـێ زماندا کوردی، فارسـی، تـورکی شـاعیر و، لـە دوای ئـەوەدا حەقیقـەت مـاهیر و سـاحێب سەلیقە بوو... (سـەرجەمی بەرهـەمی موحەممـەد...، ۲۰۰۵، ب۱: ۱٤۳) سـەرەتا لـە حوجرەی مزگەوت خوێندوویەتی، بەڵام پێویستییەکانی خوێندنی ئایینی لە حـوجرە تـەواو نەکردووە، لە پاشانا مامۆستا (میرزا)ی بۆ گیراوە و لە ماڵەوە زانست و زانیاریی وەرگرتـووە.

لە سەردەمی مێردمنداڵیدا خۆی بە زمانی فەرەنسییەوە خەریک کردووە و هەندێکی لێ فێر بووە. (مێژووی ئەدەبی کوردی، ٢٠٠٤، ب٤: ٥٦٥) سەجادییش دەڵێت: جا شاعیری ئێمە -تاهیر بەگ- لە پاش ئەوە کە دێتە دونیاوە لە تەمەنی حەوتساڵیدا ئەخرێتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی منداڵان، لەپاشا میرزایەکی بۆ ڕاگیر ئەکرێ دەرزی فارسی و خەت نووسینی لە ماڵا پێ فێر ئەکا. کە ماوەیەک بەسەر ئەمەدا ڕائەبوورێ هاتوچۆی حوجرەی فەقێیانیش ئەکا هەر لە هەڵەبجە بۆ خوێندنی دەرزی عەرەبی. لەبەر ئەوە خانمی دایکی بنەماڵەی باوکی لە سنەدا بوو، گەلێ جاریش بە ناوی خزمایەتییەوە چووە بۆ سنە، نەوەک بۆ خوێندن، تەنها بۆ سەردان. بەڵام لەم سەردانەدا هەڵسوکەوتی لەگەڵ پیاوماقووڵ و ئەدیب و میرزاکانی سنەدا کردووە. ئەمەش کارێکی وەنەبێ کەمی کردبێتە سەر باری تێگەیشتنی خوێندنەکەی، بەڵکو زۆری بزواندۆتەوە بۆ ئەوە کە خوو[1] بداتە ئەدەبیات و شیفتەی عیبارەتڕەنگینی ببێ. نەختەنەختە حەزی بەوە کردووە کە فەرەنسزیش بزانێ. خۆی لەگەڵ خەریک کردووە، بەشێکی نە زۆر زیاد نە زۆر کەمی لێ وەرگرتووە... (مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٣٩٥: ٤٩٧) حەمید موستەعان دەڵێت: تاهیر بەگ ئەگەرچی لە مەدرەسەی گەورە و عالیدا نەیخوێندووە، لە مەدرەسەی ئەهلی دەرچووە، بەڵام تێگەیشتن، چشت زانین و فەراسەتی بە گوێرەی خوێندنەکەی نەبووە و زۆر ئەعلاتر بووە.

تاهیر بەگ بە چوار زوبان شیعری وتووە: کوردی، فارسی، تورکی، عەرەبی، کتێبێکی بەم چوار زوبانە بەرانبەر بە «ئەحمەدی» بە شیعر داناوە.

داخەکەم زۆرمان هەوڵ و تەقالا دا لەو ئەسەرە نایابانەمان چنگ نەکەوت، ئەم نەختەش کە دەستمان کەوت بە واسیتەی «ناهیدە خانمی» خوشکییەوە بوو، کە بۆی ناردین...

---

١- لە سەرچاوەکەدا نووسراوە (خێ) و هەڵەیە.

(ديوان؛ حەميد موستەعان، ١٣٨٠: ٣-٤) حەسەن گۆرانيش لە بارەی خوێندنی تاهير بەگەوە دەڵێت: لە تەمەنی حەوت ساڵيدا دەنێردرێتە بەر خوێندن بۆ فێربوونی قورئانی پيرۆز و كتێبی شاعيرانی فارس و كورد، وەكو: سەعدی، حافيز، شێخ ڕەزا، نالی، باباتاهيری عوريان و هەتا دوايی، هەروەها عەرەبييش كە لە حوجرەی فەقيەكانی كوردستان دەبێت فێری ببن بە جوانی فێری دەبێ... (ديوان؛ حەسەن گۆران، ٢٧١١: ١٦) تاهير بەگ هەرچەن زانيارييەكەی لە قوتابخانەيەكی گەورە و بەرزدا نەبووە، بەڵام زانيارييە گشتييەكەی و فراوانی بير و هۆشی هەرگيز لەگەڵ ئەو خوێندنەيدا نەبوو، بەڵكو بە چەن قات زياتر بوو.

تاهير بەگ بە چوار زمان هۆنراوەی هەبوو، كوردی، فارسی، عەرەبی، توركی، ئەوەی كە نيشانە و بەڵگەی زيرەكيی تاهير بەگی دەرخست لە پێش جەنگی جيهانيی گەورەدا بە ١٥ ساڵ لە سەردەمی عوسمانييەكاندا ئەوە بوو كە مێجەر سۆن هاتە كوردستانی عێراقەوە... (كورتەيەك لە مێژووی هۆزی جاف، ١٩٨٥: ٢٩-٣٠) سۆنيش لەو بارەيەوە دەڵێت: لە گەيشتنی من ئاگادار كراوە و وەڵامی سڵاوەكەمی بە فارسييەكی تەواو دايەوە، بێئەوەی كاريگەريی شێوەی كورديی پێوە بێت... (مێجەر سۆن، ٢٠١٨: ٢٣٤)

تاهير بەگ جگە لە زمانی دايكی كە كوردی بووە، بە شێوەزاری گۆرانيش سێ شيعری لێ بەجێ ماوە. زمانی فارسييش ڕوونە و ئەو شيعرانەی لێرەدا هاتوون، زۆر لەوە زياتری هەبووە، چونكە بەشێك لەو دەستنووسانەی ئێمە بەكارمان هێناون، ناتەواون و بەشێكيان لێ كەوتووە، بۆيە دەڵێين زۆر لەوە زياتر بووە. سەبارەت بە شيعری عەرەبييش ئەوا تا ئێستا هيچ كەسێك شيعری عەرەبيی ئەم شاعيرەی نەبينيوە. وەكو بەشێك لە نووسەران و لێكۆڵەران وتوويانە توركيی زانيوە، هەندێكيان دەبێت مەبەستيان ئەوە بووبێت كە لە داستانی قومارەكەيدا چەند بەيتێك هاتووە ئەو بەيتانەيان ديبێت، يان دەستنووسی شيعرە

تورکییەکانی تاهیر بەگیان دیبێت بۆیە وتوویانە تورکیی زانیوە، بەڵام ئێمە بۆ ئەوەی زیاتر ئەو بابەتە بیسەلمێنین کە شاعیر تورکیی زانیوە، ئاماژە بە وتەیەکی زێوەری شاعیر دەکەین کە دەڵێت:

تاهیر بەگی جاف فەرموویەتی:

صلیب آساینە قوردی خم زلف پریشانی
قالیرسە بوریلە اول کافر بوزار دین مسلمانی

تقریض زیور افندی:

کلامی دلپذیرک ایتدی ممنون جان حسّانی
کمال با ضیانک ایلدی دنیایی نورانی[1]

بۆ ئێمە جێگەی گومانە کەسێکی وەکو کەمالیی شاعیر کە کەسێکی نزیکی ئەو خانەوادەیە بووە و دەستنووسی بۆ ئەوان نووسیوەتەوە و ماوەیەکیش کاتبی ئەحمەد موختار جاف بووە، لەناو دەستنووسەکانیدا جگە لە یەک دوو شیعری کوردی، شیعرە کوردییەکانی تری تۆمار نەکردووە، تەنانەت بەیتێکی لە شیعری عەرەبی و تورکییشی لەم شاعیرە نەهێناوە و نەنووسیوە.

وەکو زانینی ئەو دوو زمانە -تورکی، عەرەبی- دەکرێت زانیبێتنی و قسەی پێ کردبێتن، ئەمەیش بۆ کەسێکی وەکو تاهیر بەگ لە بنەماڵەیەکی بەگزادە و خاوەن دەسەڵات و قودرەت و دیوەخان، هەمیشە میوانی گەورە و دەسەڵاتداریان هەبووە، بە دڵنیاییەوە شارەزاییی باشی لە زمانەکانی تورکی و عەرەبی و فارسی و فەرەنسی و ئینگلیزییش هەبووە، ئەگەر لە قوتابخانەی حوکوومی نەیخوێندبێت و ئاگاداری نەبوویێت ئەوا چۆن شاکر فەتتاح دەڵێت: لەگەڵ ئەوەیشدا شێخ جافر، پیاوێکی دووربین و

---

١- دەستنووسی دیوانی زێوەر، hs. Or. ١٠٨٧١، ١٩٤٢: ٢٨١.

شارەزا، لەسەرخۆ و قسەخۆش و دەم گەرمی پيشـان دا. خوێنـدەوار و زيـرەک بـوو. گـەلێ قسەی جوانجوانی لـە بابـەت زۆرزانـی ئينگليـز و نـەزانی کـوردەوە، هـەروەها لـە بابـەت پاشکەوتوويی کوردەوە کرد. سەر بـە خـانم و کورەکـانی و بـەگزادەکانی هـەورامان بـوو. زۆر خەفەتی ئەخوارد کە مەسـعوود بـەگ جێگـای ئـەو پيـاوە گەورەيـە، تـاهيربەگی بـاوکی ناگرێتەوە، باسی جوامێری و نانبدەيی و وێژەوانيی تاهير بـەگی ئـەکرد. ئـەيگوت: حـەلی خۆی، خۆی شاگردەکانی خوێندنگای تاقی کردۆتەوە لە گيرفانی خۆيشی پاداشی پـێ داون. (گەشتی هەڵەبجە و هەورامان ١٩٣٣، ١٩٧٣: ٢١-٢٢) شاکر فـەتتاح لەبابـەت تـاهير بەگەوە هەندێک شتی تريشی نووسيوە، ئێـرە جێگـەی ئـەوەی نييـە بينووسـين. سـۆنيش دەڵێت: «دەگەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، کاتێ خزمەتکارێک پێی وتم کە من دەبێ بڕۆم بـۆ لای تاهير بەگی دووەم کوڕی عوسمان پاشا لە ژنی يەکەمە، کە لـە کۆتاييیەکـەی تـردا لـە ماڵە گەورەکەدا دەژيا لەو شوێنەی ژوورەکـەی منـی لـێ بـوو. ئـەم گەورەيـە، کـە هەنـدێ زەويوزاری لە هەڵەبجەدا هەيە، ناو و ناوبانگێکی بەدەستهێناوە بۆ تواناى ئەدەبی و لەگـەڵ زمانی کوردييشدا بە فارسی و تورکييش دەدوێت، لەوەوبەريش بڕێکـی زۆر شـيعری باشـی دەنووسی». «هەروەها زانيارييەکی کەمی لە فەرەنسيدا هەيـە...»، «لـە گـەيشـتنی مـن ئاگادار کراوە و وەڵامی سـڵاوەکەمی بـە فارسـييەکی تـەواو دايـەوە، بێئـەوەی کاريگـەريی شێوەی کورديی پێوەبێت، بانگی کردم بۆ دانيشتن لە تەنيشت خۆيەوە. هەندێ پرسياری لێ کردم، لە کوێوە هاتووم و بۆ کوێ ئەچم و ئايا بە فەرەنسـی قسـە دەکـەيت، وەڵامـی هـەموو وەڵامە ئەرێنييەکانی منی دايەوە لەگەڵ..

"Et moi aussi, je sais un peu" واتـە: "منـيش کـەمێک دەزانـم" ئـەوە سەرسووڕهێنەرە لە سەرۆکێکی کـوردەوە کـە لـە ژيانيـدا بەرزاييـەکانی وڵاتـی خـۆی جـێ نەهێشتووە. وەک ئەوەی کە ئەگەر ئەو ڕەنجە زياد لە پێويست بێت بۆ ئەو، بێدەنگ بووەوە

و ئیدی لە دەرەوە دانیشتین. بێدەنگییەکە قاوەگێڕ دەیکردەوە و دەیـوت قـاوەی تـورکی، کـە خزمـەتکارەکان دەیانهێنـا. چاکەیـەکی تریشـی لەگـەڵ کـردم بـەوەی کـە لـە سـندووقە تایبەتییەکەی خۆی جگەرەیەکی پێشکەش کردم و خۆشی بۆی داگیرساندم.

لە هەمان کاتدا، بەرپرسێکی تورک گەیشـت کـە لـە خانەقینـەوە هـاتبوو بچێـت بـۆ سلێمانی، هاتە ژوورەوە و کەسێکی زۆربلێ بوو، سووربوو لەسـەر دەمەتـەقێکردن، کـە بـە چەند وشەیەکی کورتی تورکی لەلایەن تاهیر بەگەوە سنوودار کـرا. دیدارەکـەی کـورتکردەوە بەوەی هەستا و چووە ژوورە تایبەتییەکەی خۆیەوە و ئێمەیش بڵاوەمـان لـێ کـرد. (مێجـەر سۆن، ٢٠١٨: ٢٣٣ و ٢٣٤ و ٢٤٥ و ٢٤٩)

وەکو چۆن سۆن و زێوەر و... دەڵێن بە تورکی لەو دەورەدا قسەی کردووە، سۆن دەڵێت لەو دانیشتنانەی مندا کە هەبووم بە کورتترین وتە وەڵامی تورکەکانی دەدایەوە و بێزار بـووە لـە زۆر وتن، بەڵام کاتێک لەگەڵ مندا بە فارسـییەکی بـاش قسـەی دەکـرد و بـە فەرەنسـییش دەدوا، هەروەها باسی ئەوەیش دەکات کە پیـاوێکی سـەنگین بـوو و لـە شـێوەی تووڕەییـدا هەمیشە دەبینرا. لە یەکەم دانیشتنیشدا پرسیاری هاتن و چوون و بەرنامە و کارەکـانی لـە سۆن پرسیوە، هەروەها پرسیاری زمانی فەرەنسییشی لێی کردووە و پێی ڕاگەیاندووە کـە ئـەم کەمێک زمانی فەرەنسییش دەزانێت.

هەر بەم پێیـە بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە کـە تـاهیر بـەگ جگـە لـەوەی لـەناو داسـتانی قومارەکەیدا کە چەند بەیتێکی تورکی هاتووە، هیچ غەزەلێکی تـورکیی نییـە، تـەنیا ئـەو بەیتە و چەند بەیتێکی نێو داسـتانی قومارەکـە نـەبێت، ئەمـە ئـەوەمان پـێ دەڵێـت کـە تورکییەکی باشی زانیوە. زمانی عـەرەبییش وا دەزانم هەر لە سەرەتای خوێندنیەوە کە کتێبە سەرەتاییەکان بە عـەرەبی و فارسی و تـورکی بـووە، خوێندوویـەتی و فێـر بـووە، دواتـریش لەبەر ئەوەی هەمیشە میوانی عەرەب و فارس و تورک و فەرەنسی و ئینگلیزیـان هـەبووە، پەرەی بەو زمانانە داوە و پێیان دواوە.

## پلەوپایەی کۆمەڵایەتی

بۆ ئەم باسەیش دەبێت هەر پشت بە سەرچاوە مێژووییە چاپکراو و چاپنەکراوەکان ببەستین، هیچ سەرچاوەیەکی نوسخەیی و بەڵگەیی ئەوتۆمان لە بەردەستدا نییە کە ئاماژە بە ڕۆڵی سیاسیی تاهیر بەگ بکات، بەڵام هەندێک شت وەکو کتێبی چاپ و یادداشتەکان لە بەردەستدایە کە ئاماژە بە هەندێک باسوخواس دەکەن.

لە نامەی فەرهەنگیی کۆهستاندا هاتووە دەڵێت: لە دەوری حوکوومەتی عوسمانیدا قائیممەقامی هەڵەبجە بووە. (کوهستان، ١٣٢٥، ٦٩) مارف خەزنەداریش دەڵێت: کەسێکی بەزەین و زیرەک و چاوتێر بووە، هەموو هۆیێکی ژیانی خۆشی بۆ ڕەخساوە، وەک کوڕی خێزانێکی دەوڵەمەند سوارچاک و تفەنگچییێکی باشی لێ هەڵکەوتووە. دڵتەڕ بووە، حەزی لە سەیران و ڕاو و شکار کردووە، خواردنەوە و هەنگامی مەستیی پێ خۆش بووە.

بە درێژایی ژیانی تاهیر بۆ گوزەران و ماڵ بەڕێوەبردن ئارەقی ماندوویی نەڕشتووە، هیچ جۆرە کارێکی ئاسان یا قورسی نەکردووە، تەنیا ماوەیێک نەبێ بەهۆی مەقامی باوکییەوە دەسەڵاتی تورکی عوسمانی کردوویەتی بە قایممەقامی قەزای هەڵەبجە. (مێژووی ئەدەبی کوردی، ٢٠٠٤، ب٤: ٥٦٥) نەجمەددین مەلایش دەڵێت: لە دەورەی عوسمانیدا قائیممەقامی هەڵەبجە بوو، زۆر سەخی و زەکی بووە. (سۆزی نیشتمان، ١٩٤٢: ٢٢٧-٢٢٨) کەمالیی شاعیریش لەم بارەیەوە دەڵێت: لە دەوری عوسمانیدا قائیممەقامی هەڵەبجە بوو زۆر زیرەک و سەخی بووە. (گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم، ١٩٣٩: ٢٤) زێوەریش لەو بارەوە دەڵێت: پاش نیوەڕۆ سواربووین چووینە هەڵەبجە، لە ماڵی مەجید بەگی کوڕی عوسمان پاشا میوان بووین. ئاساری میواننەوازی لەوێشدا ئاشکرا بوو. شێخ بە ڕەسمی فاتیحەخوانی لەگەڵ مەلا ئەحمەدی شینکی کە مودەڕڕیسی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی بوو وە شێخ لە خدمەت خۆیا هێنابووی، چوونە خدمەت عوسمان

پاشا.

دوو سێ شەو لە هەڵەبجەماینەوە. لە تەرەف تاهیر بەگی کوڕی عوسمان پاشا دەعوەتێکمان بۆ کرا چەشنی دەعوەتەکەی عەلی بەگ. بە ڕاستی دیواخان و نان و خوانی عوسمان پاشا خوانی یەغما بوو، نەک بە خوسووسی، بە دائیمی وا بووە. غەیری سەخاوەتی ئیحسان و ئینعامیشی بێمیسل بوو. بۆ تەعمیری مزگەوتی گەورە لە سولەیمانی کە لە زەمانی بابانەکانەوە کرابوو و ڕووی لە خراپی بوو، بەجارێ پێنجسەد لیرەی عوسمانیی بۆ نارد کە سەرفی تەعمیراتی بکەن، وە بۆ عولەمای هەڵەبجە و ئەترافی ئیحسانی دەوامی ئەکرد و تەبیعەتی ئەوەندە بەرز بوو کە بهاتایە سولەیمانی میوانی کەس نەدەبوو، خانووی خوسووسیی ئەگرت. هەر وەک هەڵەبجە، ئەهلی سولەیمانی و مەئمووران ئەچوونە دیواخانەکەی. بۆ سەخاوەتی عوسمان پاشا هەرچەند بنووسرێ ڕاستە. خوا لە قیامەتیشدا ساحێب نیعمەتی کا.

لە پاش چەند ڕۆژێ کە لە هەڵەبجە ماینەوە، دوعاخوازیمان کرد، هاتینەوە ماڵی مەحموود پاشا. (گەنجینەی مەردان، ١٩٨٥: ٦٨-٦٩).

سەردار موقتەدیر لەبارەی تاهیربەگی جافەوە هەندێک وردە زانیاریمان بۆ تۆمار دەکات و دەڵێت: لەگەڵ ئەمیر ئەلعەشایر و سالار موقتەدیردا بۆ هەڵەبجە ڕۆیشتین. قائیمقامی هەڵەبجە و زیائەددین بەگ قوماندانی سنوور و تاهیر بەگی کوڕی عوسمان پاشای جاف تا یەک فەرسەخی شار هاتنە پێشوازیمانەوە. هاتنی ئێمە لەگەڵ هاتنی مستەفا بەگدا ڕێکەوت. نزیکی شارۆچکەکە سالار زەفەر و یاوەر مستەفا بەگیش پێمان گەیشتن. بەگشتی بەڕێز و شکۆوە هاتینە هەڵەبجەوە. عادیلە خانم دایکی تاهیر بەگ کە لە ژنانی ڕەوشتبەرز و پایەبەرزی جافی موڕادی بوو، ماڵەکەی خۆیی بۆ خزمەتکردنمان ئامادە کردبوو. بەڕێزی ئێمەوە ئەو ڕۆژە قائیمقام و هەموو پلەدارانی لەشکریشی دەعوەت کرد...

چەند مانگێک لەمەوپێش سلێمان خانی ئەمير ئەعزەم سەرۆکی عێلی کەڵوڕ بۆ بەغدا ڕۆيی و گەيشتە خزمەتی جەنەڕاڵ سێرپرسی کۆکس، يەک ئۆردووی تەواوی عەشايەری لەگەڵ عەشايەری کەڵوڕ و گۆراندا، لەگەڵ پێنج فڕۆکەدا بەکار هێنا و کوشتن و برين و تالآنييەکی فەجيعيان لە سەنجاوييەکان کرد و سەردار ناسری سەرۆکمانيان بە ديل گرت و ڕەوانەی بەغدايان کرد. هەنووکە خۆم لەگەڵ براکانمدا پەنامان بۆ دەوڵەتی پايەبەرزی عوسمانی هێناوە و چاوەڕوانين بەو شێوەيەی جەنەڕاڵ کۆکس فەرماندەی لەشکری ئينگليس لەگەڵ سلێمان خانی ئەمير ئەعزەمی کەڵوڕدا ڕەفتاريان کردووە بەرپرسانی دەوڵەتی ئيسلاميش يارمەتی ئێمە بدەن، بەڵێن دەدەم ئەگەر هێز و يارمەتيی تەواو و کافيمان پێ بدرێت، هەموو عەشايری سنووری ئێران و عوسمانی دژی دوژمنەکانتان بکەمە يەک و شەڕ کەين لەگەڵ ئينگليزەکان و لايەنگيرەکانياندا. ئينجا ئەو نامانەی کە سەرکردەکانی گۆران و جوانرۆ و جاف بۆميان ناردبوو، پێم نيشان دا و تايەربەگ ناوەڕۆکی نامەکانی بۆی هەڵگەڕاندەوە کە هەموويان ئامادەی ڕاپەڕين و چاوەڕوانی گەڕانەوەمن...

لەو ڕۆژەوە هاتبووينە هەڵەبجە بە شەست سوارێکەوە کە لام مابوونەوە لە ماڵی عاديلە خانمدا ميوان بووين، چی خۆی و چی تاهير بەگی کوڕی و هەموو خزمان و کەسوکار و خزمەتکارەکانيان بەوپەڕی ميهرەبانی و ڕووخۆشی و ڕەوشت چاکی و ئەدەبەوە لەگەڵماندا ڕەفتاريان دەکرد. بۆ ڕێزلێنانمان هەميشە جەمعێ لە بەگزادەکانی جافی مورادی و مەحموود پاشا خۆی ئامادە دەبوون، هەموو ڕۆژێک بۆ خواردنی نيمەڕۆ (نەهار) بيست جۆر خواردنيان ئامادە دەکرد و بۆ خواردنی ئێوارەيش بيست جۆر خواردنی جۆراوجۆريان کە زۆر چاک دروست کرابوون دەيان هێنا. چونکە عاديلە خانم لە خزمانی وەکيل ئەلمولکی سنەييە، شێوەی سفرە و خوانی لە سفرە و خوانی گەورەماڵانی ئێرانی دەچێت و

پەیوەندییەکی لەگەڵ عوسمانییەکاندا نییە. بەو نیازەوە کە لەمە زیاتر نەبمە مایەی زیان و زەحمەتی ئەم کەڵەژنە ڕێزدار و دەستگوشادە، پێشنیاری مستەفا بەگم سەبارەت بەوەی لەمەودوا میوانی دەوڵەتی عوسمانین و مووچە و ئالیکی وڵاخەکانمان دابین دەکەن بە خۆشحاڵییەوە قەبووڵ کرد، چونکە تایەربەگ پلەی سەرۆکی شارەوانیی هەڵەبجەی هەبوو، تکام لێ کرد کە ماڵێکمان بۆ بدۆزێتەوە، دایکی پەیامی نارد کە سوێند بە خوای گەورە تا لە هەڵەبجەدا بێ دەبێت میوانی من بیت، ئەگەر ساڵێک یان زیاتریش بمێنیتەوە. سەرەنجام بە هۆی سووربوونمان ڕازی بوو کە من و سالار زەفەر و سالار موقتەدیر و ئەمیر ئەلعەشایەر و لاهووتی خان و ئیسماعیل خانی موجاهید لەگەڵ دوو سێ کەس پێش خزمەتدا لە ماڵی ئەوان بمێنینەوە و باقیی سوارەکان ماڵێکی سەربەخۆیان بۆ بگرین.

ماوەی مانەوەمان لە ماڵی عوسمان پاشادا سەرجەم هەژدە ڕۆژی خایاند، خزمەتەکەیان ڕۆژ بە ڕۆژ پترتر دەبوو. لە حەقیقەتدا هەرچی سەبارەت بە گەورەیی و کارامەیی و شایستەیی و میواننەوازی ئەم شێرەژنە بنووسم کەمم نووسیوە، عوسمان پاشای هاوسەریشی لە ژیانیدا لە پیاوە گەورە و ناودارەکانی ئەم بنەماڵە نەجیبە بووە، بەڵام تاهیر بەگی کوڕی هەروەک شەهامەت و ئازایی عێڵایەتیی تێدا بە دیی نەدەکرا، بەڵام پیاوچاکێکی خۆنەویستی ڕاستگۆ و میهرەبان و ڕووخۆش بوو، شاعیرێکی بە توانا و نازکخوو [بوو]، کە لە ئەدەبیاتی فارسیدا بەهرەیەکی زۆری بە دەست هێنابوو، عاشقی حافز و سەعدی بوو و زۆربەی غەزەلەکانی حافزی تەسمیت کردبوو، شیعرە کوردییەکانی لە نازکی و زەرافەت و وردەکارییاندا کەموێنە و بەناوبانگە. (بیرەوەرییەکانی عەلی ئەکبەرخانی سەنجاوی، ۲۰۱۱: ٥٦١-٥۷۰)

ئەوەی لەم سەرچاوانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەوەیە کە تاهیر بەگ پیاوێکی ورت و وریا و خاوەن دیوەخان و سەخی و خاوەن سفرە و خوان بووە، کەسێکی کارامە و لێهاتوو بووە، چ وەکو کوڕی وەسمان پاشا و چ وەکو کەسێکی تایبەتی و سەربەخۆ، زۆربەی ئەوانەی باسی

سەخاوەت و ئەدەبیاتی تاهیر بەگ دەکەن، بە پیاوێکی نەرمونیان و هێور و ئارام و خاوەن بیرێکی تیژ دەستنیشانی دەکەن، وەکو ئەوەی بێخودی شاعیر دەڵێت:

**ئەی پیاڵەگێڕی مەجلیسی تۆ تووسی نەوزەری!**

**کەیخوسرەوی زەمانی و جەمشیدی کیشوەری**

**تەندووری دڵ بە ئاگری غەم جۆشی سەندووە**

**بەزمم دەمێکە ساردە لەبەر بێسەماوەری**

ئەم شیعرەی بێخود کە لە دیوانەکەیدا هاتووە، بە پەراوێزێک نووسراوە کە: دیارە بێخود بەم چوارینەیە داوای سەماوەری لە برادەرێکی کردووە. (دیوانی بێخود، ١٣٨٦: ١٥٩-١٦٠) لەوە زیاتر هیچ شتێکی ئەوتۆی لەسەر نەنووسراوە کە ڕوونی بکاتەوە هۆی دانانەکەی چی بووە، بەڵام لەناو نوسخەکانی نەجمەددین مەلادا ئەومان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو شیعرە بۆ تاهیربەگی جاف نووسراوە. لە نوسخەکەدا هاتووە «جارێک جەنابی مەلا مەحموود "بێخود" لە مەجلیسی تاهیر بەگی کوڕی عوسمان پاشای جاف دادەنیشێ، چاوی بە سەماوەرێک ئەکەوێ کە بۆ چایی خواردن دێتە مەجلیسەوە، گورج ئەم ڕوباعییەی ئاتی ئەفەرموێ، تاهیر بەگیش لەپاشا سەماوەرەکە بۆ بێخود ئەنێرێ». (میناى شکەستە، ١٩٤٠، ب٣: ٤٣٠)

ئەم بابەتە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە تاهیربەگی جاف و خانەوادەکەی چەندە سەخی و میواندۆست و خاوەنی دیوەخان بوون، لە بەرانبەر میواندا چەندە دڵکراوە و خۆشڕوو و دەستکراوە بوون.

لێرەدا دەبێت دیوەکەی تری تاهیر بەگیش ببینین و بزانین چۆن بووە و بیخوێنینەوە، وەکو لەو شیعرەیدا بۆ سیاسەت و وەڵامێک بۆ وەسمان پاشای باوکی نووسیویەتی و دەڵێت:

**سەد کە شاهی، حەز بکەی هەر تـۆ موکافـاتم ئەکەی**

**من قسەی حەق هەر دەکەم سا چۆن موجازاتم ئەکەی!**

**من بە تەختی خوسرەو و جامی جیهانی گـەپ دەکەم**

**تـۆ بە مەئمـووری ئیعـانەی دۆم و خەرڕاتـم ئەکەی**

لەم دوو بەیتەدا زۆر شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، تاهیر بەگ ڕوو دەکاتە وەسـمان پاشـا و دەڵێت: هەرچەندە تۆ پاشایت و دەتەوێت بەم کارەت پاداشتم بکەیت، موکافـات دوو واتـای جیاوازی هەیە، واتا پاداشتی چاکە و مانای ئازاردانیش دەدات، لێرەدا تاهیر بـەگ دەڵێـت تۆ وەکو پاشایەک نازانم بەم کارەت دەتەوێت پاداشتم بکەیت یان ئازارم بدەیت. لە ڕاسـتیدا من قسەی هەقی خۆم هەر دەکەم ئەگەرچی نازانم تۆ پاداشتم چـۆن دەدەیتـەوە! موجـازات بە هەمان شێوە دوو مانای جیاوازیی هەیە، پاداشت بە چاکە و بە خراپە، ئایا وەسمان پاشـا چۆن وەڵامی ئەم وتانەی تاهیر بەگ دەداتەوە، پاداشتەکانی پاشا چاکە دەبێت یـان خراپـە. وەکو لە بەیتی دواتردا دەبینین تـاهیر بـەگ زۆر خـۆی لـە سـەروو سیاسـەت و کورسـیی دەسەڵات و قەومێکەوە دەبینێت، وەکو دەبینی هەندێک دەڵێـت تـۆ مـن بـە کاربەدەسـت دەکەیت و هەواڵەی لای دۆم و خەڕاتەکانم ئەکەیت، وەکو دەگوترێت ویستوویانە بینێرن بـۆ وەرگرتنی باج و سەرانەی ئەو دۆم و خەڕاتانـەی ناوچـەی سـەیید سـادق کـە سـاڵانە بـاج و خەراجیان بە ماڵی وەسمان پاشـا داوە، ئیـدی ئـەو بـاج و سـەرانەیە لەسـەر هەرچییـەک بووبێت، بۆ خودی دەسەڵات و سیاسـەتی ناوچـەیی بووبێـت، یـان شـتانێکی تـر بووبێـت، هەرچەندە ناوی ناوچەکەی نەهێناوە، بەڵام ئەوە ڕوونـە کـە وەسـمان پاشـا داوای لـێ کـردووە بڕوات بۆ ئەو ناوچەیە و ئەویش ڕەتی کردووە و ئەم شیعرەی بۆ نووسیوە. سـەججادییش لـە بارەی چیرۆکی ئەم شیعرەوە هەندێک قسەی کردووە و ئاماژەی پێکردووە. (ڕشـتەی مـرواری، ۲۰۱۰، ب٥: ٥٠٧) دەبێت ئەوەیش لـەبیر نەکـەین لـە بـەیتی دووەمـدا کاتێـک باسـی تەختی خوسرەو و جامی جەم و جیهانبینی دەکات، لە بیرەوەرییەکانی عـەلی ئەکبـەرخانی

سەنجاوییشدا دەڵێت پلەی قایمەقامییەتی هەڵەبجەی هەبووە. خۆی ئەمە جگە لەو شوبهاندنە، وەکو دەگوترێ ئەو بیری وردتر و دوورتری هەبووە، هەروەکو چۆن سۆن دەڵێت: تاهیر بەگ بانگی کردم و لە تەنیشتییەوە دانیشتم و دەستی کرد بە قسەکردن لەبارەی بەهاکانی فەرەنسی و فارسییەوە. (مێجەر سۆن: ٢٠١٨، ٢٤٠) سۆن لە لاپەڕە (٢٤٢ و ٢٤٣)دا دیسانەوە باسێکی تری تورکی قسەکردنی تاهیر بەگ لەگەڵ تورکە سەربازەکاندا دەکاتەوە، هەروەها باسی بەبێدەنگی دانیشتنی تاهیر بەگ دەکات و دەڵێت: توند پرسیاری لە من کرد کە بۆچی لە ئەستەمبوڵ نەماومەتەوە. پاشان دەڵێت: وردەوردە دەستی کرد بە پرسیارکردن لەبارەی شوێنە جیاوازەکان و چووە ناو وتوویژی سیاسەتەوە و لەبارەی باڵقان و دوورگەی کریتەوە و پرسیارەکانی تاوتوێ دەکرد و خۆی دەرخست کە بەشێوەیەکی بەرچاو زانیاریی باش و وردی هەیە، هەرچەند مەسەلەی وا بۆ من گرنگیی ئەوتۆی نەبوو، لەوانە بوو زانیاریی لەبارەی خاڵە نزیکەکانی نزیکتر لەماڵەوەی بدەمێ، لەسەر سنووری باکووری کە تورکەکان هێرش دەکەنە سەر خاکی ئێران. هەروەها وەکو وتمان تاهیر بەگ زۆر گەورەتر بیری کردووەتەوە و دونیابینیشی جیاوازتر بووە، بۆیە بەو شێوەیە خۆی نیشان داوە کە ئەو بەو بابەتگەلە ڕازیی نییە و نایەوێ بۆ وەها کارێک بڕوات و خۆی بە کەم دێتە پێش چاوان ئەگەر کارگەلێکی وەها ئەنجام بدات. (ڕشتەی مرواری، ٢٠١٠، ب٥: ٥٠٧) هەر بۆیە لە بەیتەکانی تریدا دەبینین تاهیر بەگ چۆن هەڵدەچێت و دەڵێت:

**من بە سەد مننەت لە نوقڵی لێوی یاری خۆم ئەخۆم**
**تۆ بە شاگردی دووکانی مەردی قەنناتم ئەکەی**
**مـن ڕەزا نابم بە نانی گەندومی ئادەمفەریب**
**تۆ بە ئومێدی کولێرەی جەوت و زوورڕاتم ئەکەی**

**مـن لە شـاهی سـاحێبی فیـل و عەلەم پەروام نیـیە**

**تـۆ لەژێـر دەسـتی پیـادە و ئەسـپتا مـاتم ئەکەی**

**(فی المثل) من (مسلم)م دەعوای موسڵمانیم هەیە**

**تـۆ حەواڵەی مەسـئەلەی ئینجیـل و تەوراتـم ئەکەی**

**نەزم و نەسـری تـاهیر ئیمـڕۆ بـۆتە ئەورادی زوبـان**

**تازە دێی فێـری قەسـیدە و شـیعر و ئەبیـاتم ئەکەی؟**

ئەو لە لێوی یارەکەیشـی ئەگـەرچی نوقـڵ دەخـوات، بـەڵام ئـەو سـەدجاران مننـەتی بەسەردا دەکات، ئەم بەخۆنازینەی لەم چەند بەیتەدا زۆر بەجوانی دەردەکـەوێت. مـن بـەو مننەت و بەرزیی و کەسایەتییەوە تۆ دەتەوێت بڕۆم شـاگردی و بچـووکیی خـەڵک بکـەم؟ هێشتا ئەو بە نانی گەنمیش ڕازی نییـە و لـە نـانی گـەنم باشـتری خـواردووە و هەیـەتی. هەڵچوونەکەی تاهیر بەگ دەگاتە ئەوەی بڵێت ئەو لـە شـاهی خـاوەن فیـل و عەلـەمیش پەروای نییە و باکی نییە، تۆ بەم کارەت کە بە منی دەکەیت و دەمخەیتـە نـاو سیاسـەت و فەرمانبەردارییەکەوە، جگە لە ژێردەستەیی و پیادەیی، لە سواربوونیشدا من مات ئەکەیت و دەمکوژیت و بچووکم دەکەیتەوە. ئەم کارە لە ئاستی شان و شەوکەتی منـدا نییـە، بۆیـە ئەنجامی نادەم.

بۆیە دەبینین تاهیر بەگ لێرەدا خۆی وەکو شایەک نیشان داوە کە سەرپەرشتیی کـاری کردووە نەک بڕواتە نێو کاری ئیدارییەوە و خـۆی بـە کـاری بچووکـەوە سـەرقاڵ بکـات. ئەم هەڵوێستەی ئەو وەکو شایەک و ڕاوێژکارێکی گەورە و بە دەسەڵات دیاریی دەکات و نیشان دەدات، بەو باج وەرگرتنانە خۆی بە بچووک و ڕیسوا پێ دەردەکەوێت و نایـەوێت ئـەنجامی بدات و ئەنجامی نادات.

## کاریگەریی شاعیرانی فارس لەسەر شیعرەکانی تاهیر بەگ

هەموو شاعیرێک کاریگەریی شاعیرێک یان زیاتری لەسەرە، لە ڕوانگە جیاوازەکانەوە سوودیان لێ وەردەگرێت. عەلی ئەکبەرخانی سەنجاوی کە تاهیر بەگی دیوە و شیعرەکانی خوێندووەتەوە، دیارە دیوانەکەیشی دیوە و ١٨ ڕۆژ لە ماڵیاندا ماوەتەوە، دەڵێت: شاعیرێکی بە توانا و نازکخوو [بوو]، کە لە ئەدەبیاتی فارسیدا بەهرەیەکی زۆری بە دەست هێنابوو، عاشقی حافز و سەعدی بوو و زۆربەی غەزەلەکانی حافزی تەسمیت کردبوو، شیعرە کوردییەکانی لە نازکی و زەرافەت و وردەکارییاندا کەم وێنە و بەناوبانگە... (بیرەوەرییەکانی عەلی ئەکبەرخانی سەنجاوی، ٢٠١١: ٥٦٩) ئەم دیوانەیش شاهێدی ئەوەیە کە تاهیر بەگ زۆر بە ئەدەبیاتی فارسی کاریگەر بووە، بەتایبەت بە حافزی شیرازی.

بۆ ئەم باسەیش پێمان خۆشە چەند نموونەیەک لەو کاریگەری و نیشانانەی لە شیعری تاهیر بەگدا دیارەن نیشان بدەین. ئەم کاریگەرییەیش دەتوانین لە سێ ڕووەوە تەماشای بکەین و ببینین، تەخمیسکردنی شیعری حافز، کاریگەریی حافز لەسەر شیعرە فارسییەکانی تاهیر بەگ، کاریگەریی ناوبراو لەسەر شیعرە کوردییەکانی. هەر بۆ ئەم مەبەستەیش لەناو ئەم دیوانەدا یەک شیعری تاهیر بەگ هەیە کە تەخمیسی شیعری حافزی کردبێت. تەنیا حافز کاریگەریی لەسەر تاهیر بەگ نەبووە، شاعیرانی تریش کاریگەرییان لەسەر تاهیر بەگ بووە و تاهیر بەگ سوودی لە فیکر و بۆچوونیان وەرگرتووە. لەم بابەتەدا هەوڵ دەدەم هەندێک لەو شیعرانە بخەمە ڕوو:

### ١- تەخمیسکردنی شیعری حافز

بەپێی ئەو قسەیەی عەلی ئەکبەرخانی سەنجاوی دەڵێت تەواوی شیعرەکانی تەسمیت کردووە، بەڵام لەوانەیە ئەمە زیادەڕەوی بێت، ئەوەی لەم دیوانەدا دەبینرێت ئەوەیە کە وەکو

سوودلێوەگرتن، سوودی لە حافز وەرگرتووە، لەم بەشەی دیوانی تاهیر بەگدا کە لە بەردەستدایە یەک شیعری حافز دەبینرێت تەخمیس کرابێت، ئەویش ئەم شیعرەیە:

**هردم از شوق رخت نعره زنان برخیزم**

**هر سحرگه، ز غمت خسته روان برخیزم**

**به هوای قدمت دست فشان برخیزم**

**«مژدهٔ وصل تو کو کز سر جان برخیزم**

**طایر قدسم و از دام جهان برخیزم»**

یان دەبێت ئەو شیعرانەی کە دەڵێن تەسمیت کراوە، لە دەفتەرێکی تریدا بوویێت و ونبوویێت.

**٢- کاریگەریی حافز لەسەر شیعرە فارسییەکانی تاهیر بەگ**

کاریگەریی حافز لەسەر شیعرە فارسییەکانی تاهیر بەگ بەم شێوەیەی خوارەوە دەردەکەوێت:

حافز لە شیعرێکی پرسیار و وەڵامدا دەڵێت:

**گفتم ای سلطان خوبان رحم کن بر این غریب**

**گفت در دنبال دل ره گم کند مسکین غریب**

**گفتمش نگذر زمانی گفت معذورم بدار**

**خانه پروردی چه تاب آرد غم چندین غریب**

(دیوان حافظ، ١٣٨٦: ١٧)

تاهیر بەگیش لەژێر کاریگەریی شیعرەکەی حافزدا ئەم شیعرە دەڵێت:

**گفتمش مشک است این؟ گفتا که نه، موی من است**

**گفتمش خوب است مه، گفتا که چون روی من است**

حافز لە کۆتاییی شیعرەکەیدا دەڵێت:

**گفتم ای شام غریبان طره شبرنگ تو**

**در سحرگاهان حذر کن چون بنالد این غریب**

**گفت حافظ آشنایان در مقام حیرتند**

**دور نبوَد گر نشیند خسته و مسکین غریب**

تاهیر بەگیش لە کۆتاییی شیعرەکەیدا دەڵێت:

**گفتمش عاشق چه بوید چون تو دوری از برش؟**

**گفت گل در گلستان مانندهٔ بوی من است**

**گفت با من کاردانی کیست طاهر دلبرت؟**

**گفتمش آن سرو بالا چشم‌آهوی من است**

حافز لە جێگایەکی تردا کە باس لە ساقی و جام و خەمی ڕۆژگار دەکات، دەڵێت:

**ساقیا برخیز و در ده جام را**

**خاک بر سر کن غم ایام را**

(دیوان حافظ، ١٣٨٦: ١٢)

تاهیر بەگیش هەر لەژێر ئەم بۆچوون و ئاوازەدا دەڵێت:

**ساقیا! برخیز جامی زان می پر شور ده**

**تا بشویم گرد غم از لطف تو من از حواس**

لە جێگایەکی تریشدا تاهیر بەگ بەهەمان شێوە دەڵێت:

**ساقیا! برخیز جامی ز آن می چون لعل ده**

**یک زمان آسوده باشم تا ز چرخ چنبری**

دیسانەوە حافز لە جێگایەکی تریدا دەڵێت:

**من نه آن رندم که ترک شاهد و ساغر کنم**

**محتسب داند که من این کارها کمتر کنم**

(دیوان حافظ، ١٣٨٦: ٢٥٤)

تاهیر بەگیش دەڵێت:

**حاشَ للّه در بهاران توبه از ساغر کنم**

**روی را با نشئهٔ می روز و شب احمر کنم**

دیسانەوە حافز لە جێگایەکی تردا دەڵێت:

**دور شو از برم ای واعظ بیهوده مگوی**

**من نه آنم که دگر گوش به تزویر کنم**

(دیوان حافظ، ١٣٨٦: ٢٥٦)

تاهیر بەگیش دەڵێت:

**واعظ ز پند بیثمر آزاد کن دیوانه را**

**یک دم بگیر این جام زر بگذار این افسانه را**

ئەوەی پێشەوە کە نیشان درا، دوو نموونە لەو کاریگەرییانە بوو کە حافز لەسەر شیعرە فارسییەکانی تاهیربەگی جاف هەیبووە. وەکو وتمان کاریگەریی لەسەر شیعرە کوردییەکانیشی هەبووە، لێرەدا دوو نموونە لەو کارێگەرییانەیش دەخەینە ڕوو.

**٣- کاریگەریی حافز لەسەر شیعرە کوردییەکانی تاهیر بەگ**

تاهیر بەگ لە شیعرە کوردییەکانیشدا سوودی لە حافز وەرگرتووە و کاریگەریی حافزی لەسەر دیارە، هەر بۆیە لەم باسەدا چەند نموونەیەکیش لەو کاریگەری و سوودلێوەرگرتنانە دەخەینە ڕوو. لە غەزەلێکدا حافز دەڵێت:

**یا رب آن زاهد خودبین که به جز عیب ندید**

**دود آهیش در آیینهٔ ادراک انداز**

(دیوان حافظ، ١٣٨٦: ١٩٦)

تاهیر بەگیش لەم ڕوانگەوە دەڵێت:

**زاهیدی خودبین کە حەیوانە لە وادیی عەشقدا**

**ڕیشەکەی پان و درێژی ڕەشمە و هەوسارییە**

لە جێگەیەکی تردا حافز دەڵێت:

**اگر آن تُرک شیرازی بە دست آرد دل ما را**

**بە خال هندویش بخشم سمرقند و بخارا را**

(دیوان حافظ، ١٣٨٦: ٨)

تاهیر بەگیش لەم بارەوە دەڵێت:

**مولْکی عەجەم و ڕۆمە بەهای بۆسەیی لێوی**

**دەیکەم بە فیدای یەک نیگەهی مامش و بلْباس**

وەکو دەبینین تاهیر بەگ کە چەند کاریگەریی حافزی لەسەر هەبووە، هەوڵی داوە کە لەو وێنانەی حافز بە فیکرێکی کوردانەوە دابڕێژێتەوە و جا ئەو دارشتنانەیش لەناو دەقێکی کوردیدا بێت، یان دەقێکی فارسی، گرنگ بۆ تاهیر بەگ دەق و وێنەی کوردانە بووە. لە شاعیرانی تری وەکو سەعدی، نیزامی و... سوودی وەرگرتووە و پێیان کاریگەر بووە. ئێمە لێرەدا هەر ئەوەندە لەسەریان دەنووسین.

## کاریگەریی شاعیرانی کورد لەسەر تاهیر بەگ

تاهیر بەگ وەکو هەر شاعیرێکی تر، چۆن کاریگەریی شاعیرانی فارسی لەسەر بووە، لە هەمان کاتیشدا کاریگەریی شاعیرانی کوردی لەسەر بووە، یان سوودی لە وێنا و جوانکارییەکانی ئەوانیش وەرگرتووە، یان ویستوویەتی وەکو بەرانبەرکێیەک نیشانی بدات.

شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە شیعرێکیدا دەڵێت:

مەربووتــە حــەیاتم بــە ســولەیمانی و خــاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپییەکەی ئەحمــەدی کــاکی

(دیوانی شێخ ڕەزا، ۲۰۰۳: ۱۰۵)

تاهیر بەگیش لە ژێر ئەو کاریگەری و ڕیتم و مۆسیقایەی شێخ ڕەزادا دەڵێت:

مەربــــووتە حەیــــاتم بە بیــــارە و بــــە دیــــاری
خۆزگەم بە سەگی قــاپییەکەی قــوتبی مەداری
ئەم کــــاولە دونیــــایە لەنەو زیــــر و زەبەر بــــێ
پاش ئەحمەدی موختار و ئەبوویەکر و سێ یاری

یان لە جێگەیەکدا ئەدەب دەڵێت:

دڵ لە حەسرەت غەمزەکەی دوو نێرگسی پڕ خەوتــەوە
وەک خەمی زوڵفت عەزیزم، چوو بە ڕوودا و کەوتەوە

(دیوانی ئەدەب، ۲۰۰۵: ۲۱۸)

تاهیر بەگیش دەڵێت:

تــا بەکەی قوربــان بنــاڵم مــن بە ئــێش و دەردەوە
دەس بە ئەژنۆ، قوڕ بە سەر، دایم بە ئاهی ســەردەوە
ڕۆژی ئەووەڵ بــوو کە زانــیم مــن ئەبــێ دێــوانە بــم
عاشقی تۆ، نەوعی مەجنوون، وا بە کێــو و هەردەوە

یان لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

دڵ نەخۆشــی دەردی هیجــرە، جــانی جانــانم وەرە
لەتــلەتە جەرگ و هەنــاوم، مــاهی تابــانم وەرە

**عیللەتی دەرد و شەفاکەم وا بە لێوی شەککەرت**

**مایەیی ژین و حەیاتم، دەرد و دەرمانم وەرە**

ئەمانە و چەندین نموونەی تری هەن کە ئەوەمان پێ دەڵێن تاهیر بەگ لەژێر کاریگەریی شاعیرانی پێش خۆیدا شیعری وتووە و بەرانبەرکێیانی کردووە، نیشانی داوە ئەویش دەتوانێت شتگەلێکی وەکو ئەوان بڵێت، یان لە بەرانبەر ئەواندا خۆی نیشان بدات و بڵێت ئێوە ئەوەتان گوتووە، ئەز ئەمەم گوتووە. لە تای تەرازووی شیعردا کامیان جێگا دەگرن، ئەوە لێکۆڵەران دەتوانن ئەوە بسەلمێنن و نیشانی بدەن کامەیان جوانتر و چێژبەخشترە.

## کاریگەریی تاهیر بەگ لەسەر شاعیرانی کورد

وەکو چۆن شاعیرانی کورد و فارس کاریگەرییان لەسەر تاهیر بەگ هەبووە، لە هەمان کاتیشدا تاهیر بەگ کاریگەریی لەسەر شاعیرانی کورد بووە و شیعرەکانی تاهیر بەگ بووە بە ڕێبازێکی ئەدەبیی تایبەت بە خۆی و شیعرەکانی لەلایەن شاعیرانەوە پێشوازیی لێ کراوە، چ وەکو وێنەی شیعری، چ وەکو مۆسیقای شیعری و لایەنەکانی تریش لە تەخمیسکردن و...

کەریمخانی ئیختیاردینی «عیززەت» لە بەرانبەر شیعری (دڵ نەخۆشی دەردی هیجرە)ی تاهیر بەگدا ئەم شیعرەی نووسیوە و دەڵێت:

**دڵ سووتاوی ناری حیرمانە، بە خەمخوارم وەرە**

**ڕۆح کوژراوی دەردی هیجرانە، لە خەمخوارم وەرە**

(مەندەی زەمانە، ١٣٩٥: ٥٩)

بێداریش لەم بارەوە دەڵێت:

**دڵ دەناڵێنێ لە هیجرت شـاهی خوبیـانم وەرە**

**ئینتیزاری چـاوەکانم جـانی جـانـــانم وەرە**

(بەشێک لە دیوانی شێخ باباعەلی بێدار، ٢٠٠٣: ٥٥)

مەلا غەفووریش هۆنراوەیەکی بەم چەشنەی هەیە و دەڵێت:

**دیـدەیی نــوورم لە دووریــت نــووری چـاوانم وەرە**

**شــەهدی وەسـڵی تـۆم دەوایە خونچەخەنـدانم وەرە**

(دیوانی میرزا غەفوور، ١٩٩١: ٧٣)

چەندین شاعیری کورد پێشوازییان لە شیعری تاهیربەگی جاف کردووە و شیعری تـاهیر بەگیان تەخمیس کردووە، لەوانە: ئەدیب، ئەحمەدموختار جاف، میـرزا غـەفوور، ئـەدیب، ئەسعەد ڕاستین «ژیان»، شێخ موحەممەدی هەڵەبجەیی، جەریحی، نـاری، زێـوەر، مـەلا ڕەسووڵی گۆڵێ و پاکی و...

ئەحمەدموختار بەگی جاف، برای تاهیربەگی جاف شـیعرێکی کـوردیی تـاهیر بـەگی تەخمیس کردووە، بە هەمان ڕیتم و مۆسیقای شیعری و سەبکی شاعیر:

**کە مـن گوڵزاری ڕووی تۆم بێ لە سەیری گوڵستانم چـی؟**

**قەد و باڵایی تـۆ خـۆش بـێ لە سـەروی بوسـتانم چـی؟**

**کە عەشقی تـۆ لە سـەرمایە، لە تـانەی واعیـزانم چـی؟**

**«موقەددەر گەر نەبێ ئاخر لە میهری مەهروخانم چـی؟**

**لە ناڵەنـاڵی نیـوەی شـەو، لە ئـاهی بەربەیـانم چـی؟»**

(کۆبەرهەمی ئەحمەدموختار جاف، ٢٠١٩: ٢٢٤)

لە شیعرێکی فارسیشدا ئەحمەدموختار دەڵێت:

**ای دلبـر مـن خیـز و تـو طـرح دگـر انـداز**

**در کاسـکی زرّیـن، تـو یـاقوت تـر انـداز**

**بـردار حجـاب از رخ یـک شـور و شـر انـداز**

**«گـل بـرگ تنـا برقـع نیلـی ز سـر انـداز**

**آتـش به مـن سـوختەی در بـه در انـداز»**

(کۆبەرهەمی ئەحمەد موختار جاف، ٢٠١٩: ٢٥٢)

ناریی هاوڕێی ڕۆحیی تاهیر بەگیش جگە لەوەی لەگەڵ ناوبراودا چەند نامەیـەکیان بـۆ یەکتری ناردووە و لە هەمان کاتیشدا لـە چەنـد شـیعرێکدا ڕووی دەمـی لـە تـاهیر بـەگ دەکات و وەکو گفتوگۆکار و پەنایەک لێی ڕوانیـوە. وەکـو لـە شـیعری بـە غـەمزەی چـاوی مەخمووریدا دەردەکەوێت، ئەو شیعرەی کە وای لە خەڵکێکی زۆر کـردووە وای دابنـێن ئـەو شیعرە هەردووکیان پێکەوە دایاننـاوە. تەخمیسەکە بەشێوەیەیە:

**سەبا سۆزەی نەسیمت با لـە بـۆ شـادیی گـوڵان بـا بـێ**

**دەمێ سروەت لە بۆ تەسکینی مورغی سەرچڵان با بـێ**

**بـە قـانوونی عیبـادەت بـۆ مـوقیمی مـەنزڵان بـا بـێ**

**«چەمەن یـەکبارە، خامۆشـە خرۆشـی بولبـولان بـا بـێ**

**دڵ ئەمڕۆ مات و مەدهۆشە، خوا فەسڵی گوڵان با بێ»**

(دیوانی ناری، ٢٠١٤: ٣٢٢)

ئەمە بەشێکی کەمە لە شیعری ئەو شاعیرانەی کە شیعری تـاهیر بەگیـان تـەخمیس کردووە، یان لە ژێر کاریگەریی شیعری تاهیر بەگدا شیعریان داناوە و پێی کاریگەر بوون.

## تاهیر بەگ و مێجەرسۆن

لە باسی خوێندەواریی تاهیر بەگدا باسـی زمـان و ورت و وریـایی شـاعیر کـرا، باسـی ئەوەیش کرا کە مێجەر سۆن و تاهیر بەگ بە فەرەنسی بە یەکەوە قسەیان کردووە. مێجـەر

سۆنیش لەنێو کتێبەکانیدا زۆر باسی تاهیربەگی جاف و بنەماڵەیانی کردووە، بەڵام باسی ئەوەی نەکردووە کە لەسەر گوتنی (No) لەبری نا، تاهیر بەگ پێی زانیبێت کە ئینگلیزە و دەری کردبێت. ئیدمۆنسیش لە کتێبەیدا کە باسی ئەم بابەتەی هێناوە، لە پەراوێزێکەیدا دەڵێت: لە پێشەکیی دیوانی شیعری تاهیر بەگدا نەنووسراوە. (کورد تورک عەرەب، ٢٠٠٤: ١٩٤) ئیدمۆنس لە ساڵی ١٩٥٧دا کتێبەکەی خۆی چاپ کردووە، دیوانی تاهیر بەگیش بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٣٥-١٩٣٧ی زایینی چاپ بووە. دەکرێت ئیدمۆنس هەر وەکو ئاماژەدانێک و شەنوکەوکردنێک ئەم بابەتەی هێنابێت. ئیدمۆنس کاتێک کە بابەتەکەی هێناوە، کتێبەکەی سۆنیشی دیوە، بۆیە دوور نییە ئەم بابەتە بەلای ئیدمۆنسەوە جێی تێڕامان بووبێت، چونکە هەندێک لە قسەکانی سۆن شەنوکەو دەکات و ئەم بابەتە و زۆر بابەتی سۆن جێگەی تێڕامانە و نابێت بە هەندێک وتە و باسی تر و بەڵگەی پشتڕاستکراوی تر ببێتە جێگەی باوەڕ.

لە زۆربەی سەرچاوەکاندا باس لە ورت و وریاییی تاهیربەگی جاف دەکرێت، بەشێکی زۆر لەوانەیش کە باسی دەکەن بێ هیچ ڕەخنە و لێکۆڵینەوەیەک باسی ئەوەیان خستۆتە ڕوو کە تاهیر بەگ هەستی بەوە کردووە کە سۆن ئینگلیزە. کەسی لێکۆڵەر و ڕۆشنبیر شتێکی وەها سادە ناکاتە بنەمای ڕۆشنبیری و فیکرکراوەیی کەسێکی وەکو تاهیربەگی جاف. ئێمە لێرەدا تەواوی ئەو داستانە نانووسینەوە، نازانین ئەو داستانە کێ بۆ تاهیر بەگی دروست کردووە، لە کوێوە هاتووە، سۆن خۆی بۆچی باسی نەکردووە، ئەم بابەتە چەندە خزمەتی تاهیر بەگ بکات، سەد هێندە خزمەتی سۆن دەکات، بۆیە ئەگەر ڕاست بووایە ئەوە دەبوو سۆن باسی بکردایە. نابێت ئەوەیش لەبیر بکەین ئەم داستانە لە یەکەم چاپی دیوانی تاهیربەگی جافدا نووسراوە و هاتووە.

لێرەدا پێمان خۆشە لە ڕووی سەرچاوە و خوێندنەوەکان بۆ ئەو داستانە، لێکۆڵینەوەیەک لەو باسە بکەین. هەروەها خودی سۆنیش لە یاداشتەکانیدا چیی

دەربارەی تاهير بەگ نووسيوە ئاماژەی پێ بكەين. مێجەر سۆن دەڵێت: بانگی كردم بۆ دانيشتن لە تەنيشت خۆيەوە. هەندێ پرسياری لێ كردم، لە كوێوە هاتووم و بۆ كوێ دەچم و ئايا بە فەرەنسيی قسە دەكەيت! وەڵامی هەموو وەڵامە ئەرێنييەكانی منی دايەوە لەگەڵ "Et moi aussi, je sais un peu"، واتە: "منيش كەمێك دەزانم"، ئەوە سەرسوڕهێنەرە لە سەرۆكێكی كوردەوە كە لە ژيانيدا بەرزاييەكانی وڵاتی خۆی جێ نەهێشتووە. (مێجەر سۆن، ٢٠١٨: ٢٣٤) خودی مێجەر سۆن لە كتێبێكی تريدا دەڵێت: بەشی زۆری مانەوەم لە كوردستاندا، لە سلێمانی بوو. بەڵام لەوەی لەوێ جێگير بم، چووم بۆ هەڵەبجە، كە عادیلە خانمی جافی لێ بوو، وەك ميرزايەكی ئێرانی و بازرگانێك پەسەند كرام، تا ماوەی چوار هەفتە مامەوە. لەو كاتەدا توانيم ناسياوی پەيدا بكەم لەگەڵ وەسمان پاشا و مەحموود پاشا و تاهير بەگ و مەجيدبەگ، كە لە بنەماڵەی فەرمانڕەوا بوون. هەروەها خەريك بوو وەك نووسەرێكی ئێرانی لەلای وەسمان پاشا بمێنمەوە، بەڵام كاتێ كوتوپڕ كەسێك لە بيارەوە هات، كە خەڵكی سنە بوو لە كوردستانی ئێرانەوە، هەر كەبينيم، ڕوانيم سەرنجێكی شەڕانيی لێ دام و بە ئاشكرا دژايەتيم دەبينی بەرانبەرم، بۆيە بە چاكم زانی ئەوێ بەجێ بێڵم. (سلێمانی ناوچەيەك لە كوردستان، ٢٠٠٧: ١٣).

لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە تاهير بەگ سەرەتا پێی زانيوە كە ئەو ئێرانی نييە و بە فەرەنيسی قسەی لەگەڵدا كردووە، پێی گوتووە من كەمێك فەرەنسيی دەزانم، ئەمەيش جۆرێك ئاگاداركردنەوە بووە و ناڕاستەوخۆ پێی گوتووە كە دەزانم تۆ چييت. پێی گوتووە كە لە كوێوە هاتووە و بۆ كوێ دەچێت. ئەگەر تاهير بەگ ئينگليزيی زانيبا، ئەوا لەوانەيە لە جێگەی فەرەنسی بە ئينگليزی قسەی لەگەڵدا كردبا. هەروەها خودی سۆنيش دەڵێت بۆ ماوەی چوار هەفتە وەكو ميرزا و بازرگانێك پەسەند كرام، دواتر مامەڵەی ئەوەی لەگەڵدا نەكراوە كە پێشتر لەگەڵيدا كراوە، زۆر زياتر لەو ماوەيە ماوەتەوە كە دەيڵێن.

فەرهاد شاکەلی لە لێکۆڵینەوەکەیدا کە وەکو پێشەکیی کۆبەرهەمی ئەحمەد موختار جاف لە چاپە تازەکەیدا بڵاو کراوەتەوە، بە دوورودرێژی لەسەر ئەم بنەماڵەیەی نووسیوە و لە چەند جێگادا بە وردی باسی لەم ڕووداوە و دیدارەکانی نێوانی سۆن و عادیلە خانم و ماڵی پاشا و ڕۆیشتنی سۆنیش کردووە، لە کۆتاییی پێشەکیی لێکۆڵینەوەکەیدا دەڵێت: «سۆن ماوەیەکی دوورودرێژیش لە نزیکی خانمەوە و لە ماڵی وەسمان پاشا و عادیلە خانمدا ژیاوە. هەروەها ئێدمۆنز و لیز و نۆئێل و بێڵیش لە نزیکەوە ناسیویانە و لە نووسینەکانیاندا باسیان کردووە. دیارە سۆن و ئێدمۆنس و لیز و بێڵ و نۆئێلیش، هەر هەموویان کارمەندی هێزی کۆلۆنیالیستیی بەریتانی و جاسووسی دەزگای هەواڵگریی ئینگلیز بوون و لە دوژمنە سەرسەختەکانی گەلی کورد و ئازادیی کوردستان و شێخ مەحموود بوون.

لەبارەی پێوەندیی سۆن بە بنەماڵەی وەسمان پاشای جافەوە، عادیلە خانم و کوڕەکانی، هەندێک هەڵەی باو لەناو کورددا هەن کە دەبێ ڕاست بکرێنەوە:

یەک: سۆن لە ماڵی عادیلە خانمدا خزمەتکار نەبووە، بەڵکوو زۆریش ڕێزی لێ گیراوە و تەنانەت کوڕێکی حەمە ناوی خەڵکی موکریانیان داناوە ببێتە خزمەتکاری، ئەمەیان خۆی دەیگێڕێتەوە (Soane, ١٩١٢: ٢٤٨). سۆن سکرتێری خانم بوو (Edmonds, ١٩٥٧: ١٤٩)، نامە فارسییەکانی بۆ دەخوێندنەوە و وەڵامی دەدانەوە.

دوو: ئەو باسەی کە گوایە بە هۆی بەکارهێنانی وشەی (نۆ)وە لە جێی (نا)ی کوردی، تاهیر بەگی جاف لەوە گەیشتووە کە سۆن ئینگلیزە و ئەویش ناچار بووە خۆی ئاشکرا بکات. ئەمە هیچ بنەڕەتێکی ڕاستیی نییە و چیرۆکێکی دەستکردە.

سێ: سۆن لەو کاتەدا کە لە ماڵی پاشادا یا لە کوردستان بووە، مێجەر/مەیجەر (Major) نەبووە و هیچ پێوەندییەکی بە سوپای ئینگلیزەوە نەبووە و هیچ پلەیەکی لەو

سوپايەدا نەبووە، بەڵكوو كەسێكی سيڤيل بووە، بەڵام دەبێ كارمەند (جاسووس)ی دەزگای هەواڵگريی ئينگلستان بووبێت.

چوار: مێجەر سۆن لە ماڵی عادیلە خانم دەرنەكراوە، بەڵكوو بە ئارەزووی خۆی ئەوێی بە جێ هێشتووە. كە بڕياری ڕۆيشتنيش دەدات، عادیلە خانم و تاهير بەگيش زۆريان پێ ناخۆش دەبێت. (Soane, ١٩١٢: ٢٤٣)». (كۆبەرهەمی ئەحمەد موختار جاف، ٢٠١٩: ١٦-١٧) مەحموود عەزيز حەسەنيش لە كتێبەكەيدا گێڕانەوەكانی مێجەر سۆنی لە نووسراوەكانی خودی سۆنەوە كە چۆن چاوی بە بنەماڵەی وەسمان پاشای جاف كەوتووە، چۆن عادیلە خانمی ديوە و چلۆن تاهير بەگی ديوە و لەگەڵی دواوە خستۆتە ڕوو. (كورتەيەک لە مێژووی هۆزی جاف، ١٩٨٥: ٣٣-٤٠).

وەكو گوتمان ئێدمۆنسيش لەم بارەيەوە دواوە، كاک فەرهاديش ئاماژەی پێ كردووە، چيرۆكە دروستكراوەكەی هێناوە و قسەوباسی لەسەر كردووە. ئێدمۆنس هەندێک قسەوباسی نێو ديوانەكە دەهێنێت و ئنجا هی نێو كتێبەكەی سۆن، دواتر خوێندنەوەيان بۆ دەكات. ئێمە لێرەدا وشەی نۆكەر و ڕەفتار و تێگەيشتنی تاهير بەگ لەو باسەی سەرەوەدا وەردەگرين. لە لاپەڕەی دوای ئەم باسەدا ئێدمۆنس درێژە بە باسەكە دەدات و ئێمە كورتەی قسەكانی ئێدمۆنس وەردەگرين، ئێدمۆنس دەڵێت: «سۆن لە كتێبەكەی خۆيدا باسی ناسينی خۆی لەگەڵ تاهير بەگدا ناكات و نەک تەنيا دەری نەكردووە، بەڵكو كۆسپيشيان بۆ ڕۆيشتنی دروست كردووە. عادیلە خانيش ويستوويەتی ئەو بكاتە مامۆستای زمانی فارسيی هەردوو كوڕە بچووكەكەی، يەكێک لە كۆسپەكان ئەمين ئەفەندی، جوولەكەيەكی ئەڵمانيی خۆبەموسوڵمانكردووی بەناو ڕاوێژكار لەلای عادیلە خانم بووە، هەوڵی داوە تۆوی گومان لە مێشكی تاهير بەگدا بچێنێت. هۆی دووەميش هاتنی كەسێک بووە بە ناوی شێخ سەلام كە خۆی بە سنەيی ناساندووە و پێشتر سۆنی لە

قوستەنتەنیە دیوە و ئێستایش لە بیارە لێی دەگەڕا. سۆن دەڵێت: تەنیا کەسێک لە کەرکووک کە باسی خۆمم بۆی کردووە، فەلەیەکی خەڵکی مووسڵ بووە و لە سلێمانی پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵدا پەیدا کردبوو، من خۆم ڕۆژێک لە عادیلە خانمم پرسی: کاتێک سۆن لەماڵتان بوو هەرگیز شکت لێی کردووە؟ وتی: لە ڕاستیدا بیرمە ڕۆژێک تاهیری کوڕم هاتە لام و وتی: لام وایە ئەو غولام حوسێنە ئەورووپاییی بێت، بەڵام من وتم: هەرچۆنێک بێت ئەو لای ئێمە میوانە و نابێت خۆمان لە کارێک وەردەین کە پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە. دوای شەش حەوت مانگ تازە تاهیر بەگ شەکی لێ کردبێت». (کورد تورک عەرەب، ٢٠٠٤: ١٩٤-١٩٥) لەم باسەدا زۆر شت هەیە لێی نەکۆڵراوەتەوە، لە ڕێگەی ئەو سەرە باسانەوە دەبێت هەندێک قسەوباس باس بکرێت و لێیان بکۆڵرێتەوە.

وەکو دەبینین سۆن دەڵێت ماوەیەک بەناوی غولامحوسێنی شیرازی وەکو نۆکەر و بازرگان و کەسێکی چالاک کاری کردووە، خۆیشی دەڵێت بە فەرەنسی لەگەڵ تاهیر بەگدا قسەوباسمان کردووە، شتێکیش بووبێتە هۆی دەرچوونی لە هەڵەبجەدا، ئەو شێخ سەلامە بووە و تاهیر بەگیش پێی ناخۆش بووە کە ڕۆیشتووە، بەڵام ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بێت، باشە شیرازییەک چۆن فێری فەرەنسی بوو؟ ئەی ئەو کاتە چۆن تاهیر بەگ پێی نەزانیبوو؟ دەی خۆ ئەو گوتبووی من شیرازیم و بۆچی بە فارسی لەگەڵیدا نەدواوە، بەڵکوو بە فەرەنسیی لەگەڵیدا دواوە؟ وای بۆ دەچم ئەو قسەیەی عادیلە خانم بۆ دەمکوتکردنی ئیدمۆنس بووبێت و نەیویسبێت لەسەر بابەتەکە بچێت، یان دەکرێت بۆ ئاڵۆزکردنی بابەتەکە و پێچاندنی بووبێت.

سەبارەت بە مامۆستای فارسیی سۆن بۆ تاهیر بەگ و ئەحمەدموختار جافیش، ئەو کاتە تاهیر بەگ فارسییەکی باشی زانیوە و دیوانەکەی شاهیدی ئەوەیە. کەسێک ئەوەندە فارسیی زانیبێت، ئیتر لەسەر خۆیەتی کە هەوڵ بدات و فارسییەکەی باشتر بکات. هەروەها تاهیر بەگ ئەو کاتە تەمەنی لە نێوان ٣٠-٣٥ ساڵ بووە ئەگەر زیاتریش

نەبووبێت. کاتبی باوکی گۆرانیش دەرسی زمانی فارسیی تاهیر بەگی دابووبێت و لە ماڵی ئەواندا بووبێت، ئەی بۆچی کەسێکی وەکو مێجەر سۆن ڕاگیراوە؟ بۆیە گومان لەم بابەتەیشدا هەیە.

## کۆچی دوایی

بە داخەوە تاهیر بەگ جگە لەوەی ساڵی لەدایکبوونی ڕوون نییە، بگرە ڕووداوەکانی ژیانیشی تێک دراوە و جۆرێکی لێ کراوە ناتوانرێت بە نزیکترین سەرچاوەکان لە خودی شاعیریش باوەڕ بکەیت. هەر ئەوەندەی هەیە و ماوەتەوە، دەتوانین بڵێین لە نەبوون باشترە. بۆ ساڵی مردنی تاهیر بەگ ئەو سەرچاوانەی پێشتر سوودیان لێ وەرگیراوە، هەر لەگەڵ ئەوانەدا دەتوانین سوود لەو شیعرەی سلێمان بەگی کاتبی باوکی گۆرانی شاعیریش وەربگرین و ساڵی مردنی بە شێوەیەکی دروست بخەینە ڕوو.

لە ڕۆژنامەی نامەی فەرهەنگیی کۆهستاندا نووسراوە: لە ساڵی ١٣٣٧ لە سلێمانی وەفاتی کردووە، جەنازەکەیان هێناوەتەوە بۆ عەبابەیلە کە یەکێ بووە لە ئەسحاب، وە لە ژوور هەڵەبجەوە نێژراوە. تاهیر بەگیشیان لەوێ بە خاک سپاردووە. (کوهستان، ١٣٢٥: ٦٩) ئەمین زەکی بەگیش دەڵێت: لە ١٩٢٧م.دا وەفاتی کرد. (سەرجەمی بەرهەمی موحەممەد، ٢٠٠٥، ب١: ١٤٣) خەزنەداریش لەم بارەیەوە دەڵێت: لەبەرئەوەی تاهیر بە لەش لەڕ و لاواز و نەخۆش بووە، ژیانی کورت بووە، لە تەمەنی چل ساڵیدا نەخۆشی کاری لێ کردووە، بۆیە بردوویانە بۆ سلێمانی و لە ساڵی ١٩١٨ کۆچی دوایی کردووە. تەرمەکەیان بردۆتەوە بۆ گوندی عەبابەیلێ لە باکووری هەڵەبجە، لە گۆڕستانی بەناوبانگی ئەوێ ناشتوویانە... (مێژووی ئەدەبی کوردی، ٢٠٠٤، ب٤: ٥٦٥) نەجمەددین مەلایش بەم شێوەیە لە باسی مردنی تاهیر بەگ دواوە: ٤٤ ساڵ ژیاوە، لە ساڵی ١٩١٨م.دا وەفاتی

كردووه، له دێی "عه‌بابه‌یلێ" نێژراوه. (سۆزی نیشتمان، ١٩٤٢: ٢٢٧-٢٢٨) كه‌مالیی شاعیریش هه‌ر له نه‌جمه‌ددین مه‌لاوه وه‌ری گرتووه و ده‌ڵێت ٣٣ ساڵ ژیاوه، به‌ڵام ئه‌مه هه‌ڵه‌ی تایپییه و ٤٣ ساڵ بووه. (گوڵده‌سته‌ی شوعه‌رای هاوعه‌سرم، ١٩٣٩: ٢٤) له دیوانه‌كانیشدا به هه‌مان شێوه نووسراوه: له ساڵی ١٣٣٧ له دونیا ده‌رچووه، وه له سلێمانی عومری خودای كردووه، جه‌نازه‌كه‌یان هانیوه‌ته‌وه بۆ هه‌ڵه‌بجه له عه‌بابه‌یلێ كه یه‌كێكه له (صحابه)، سه‌عاتێ له ژوور هه‌ڵه‌بجه‌وه‌یه نێژراوه. (دیوان، حه‌مید موسته‌عان، ١٣٨٠: ٣-٤) سه‌ججادییش له‌و باره‌یه‌وه ده‌ڵێت: بێجگه له‌م ده‌وره كه‌مه ژیانی خۆی به ملكداری و شۆخوشه‌نگی ڕائه‌بوێرێ، تا له ١٩١٧ له‌به‌ر نه‌خۆشی هێناویانه بۆ سوله‌یمانی و له‌وێ له ته‌مه‌نی ٤٢ ساڵیدا ئه‌مرێ و لاشه‌كه‌ی ئه‌برێته‌وه بۆ بناری هه‌ڵه‌بجه، له گۆڕستانی دێی "عه‌بابه‌یله"-كه ٣ میلێك كه‌وتۆته شیمالی هه‌ڵه‌بجه‌وه- ئه‌نێژرێ. (مێژووی ئه‌ده‌بی كوردی، ١٣٩٥: ٤٩٧-٤٩٨) مه‌حموود عه‌زیز حه‌سه‌ن و كه‌مال فوئاد و چه‌ند كه‌سێكی تریش به سوودوه‌رگرتن له هه‌ندێك سه‌رچاوه، ساڵی ١٩١٨یان بۆ مردنی تاهیر به‌گ داناوه. وه‌كو گوتمان سلێمان به‌گی باوكی گۆران، به دوو شیعری فارسی شینێكی بۆ تاهیر به‌گ نووسیوه و له دیوانه چاپكراوه‌كانیشدا هاتووه، ئه‌م دوو شیعره له ده‌ستنووسی مه‌لا ئه‌حمه‌دی ده‌ككه‌یشدا هاتووه. سلێمان به‌گ له باره‌ی مردنی تاهیر به‌گه‌وه ده‌ڵێت:

این چه غوغاایست یا رب کوفتاده در زمین؟
جمله عالم مات و حیران در لباس ماتمین
با وجود فصل فروردین چمن همچون خزان
گل ز تن، جامه درید و کرد زاری یاسمین
گشت گریان از سما ناهید خندان شد چنان
زانکه طاهر رفت از دنیا، به فردوس برین

**سـال تـاریخ وفـاتش جسـتم از حـور بهشـت**

**گفت برگو «جـان وی تحـت الـواء المرسـلین»**

بەپێی ژمارەی ڕیزبەندی پیتەکان، ڕستەی «جـان وی تحـت الـواء المرسـلین» کـە لـە دەستنووسەکەدا بەو شێوەیە هاتووە، وشـەی (الـواء) هەڵەیـە و دەبێـت (لـواء) بێـت، کـە دەکاتە ساڵی مردنی تاهیربەگی جاف، بۆ ئەم مەبەستەیش لێرەدا بـە باشـی دەزانـین ئـەو ڕستەیە لێک بدەینە و دواتر بەرانبەر بە ساڵی زایینییش دایبنێین.

جـان= ٥٤، وی= ١٦، تحـت= ٨٠٨، لـواء= ٣٧، المرسـلین= ٤٢١= ١٣٣٦ی کۆچی. سلێمان بەگ لە شیعرەکەیدا دەڵێت: مانگی فـەروەردین کـە مـانگی بـەهارە، بـە تەمەنی جوانیی تاهیر بەگ شوبهێنراوە، خەزانەکەیش مردنی شاعیرە، بەم پێیە گومـانی زیاد دەکرێت شاعیر لە وەرزی پاییزدا مردبێت.

لەو بەرگە دەستنووسەی کە لە ماڵی حەسەن فەهمی بەگدا هەیە، نووسراوە: مـەرحووم جەننەتمەکان، شاعیری بەناوبانگ تاهیر بەگی کوڕی عوسمان پاشـای جـاف لـە تشـرینی سانی ١٩١٨دا وەفاتی کردووە.

ئەو ڕستەیەی مێژووەکەی تێدا تۆمار کراوە سەرچاوەی هەموو هەڵەتێگەیشتنەکانە. لە نوسخەی (دک)دا نووسراوە: (جان او تحـت الـواء مرسـلین) بەڵام وشـەی (او) بـازنەیەکی بەدەوردا کێشراوە و بە هێڵێک ڕستەیەکی کوردی نیشان دراوە کە نووسراوە دەبێ وی بـێ؛ لە ژێر ڕستەکەیشـدا نووسـراوە ١٣٣٧. بێگومـان ئەو ڕسـتەیە بەپێـی حیسـابی ئەبـجەدی ١٣٣٧ دەرناچێت، بەڵکو ١٢٩٧ دەردەچێت، ئەگەر لەبری (او) وشەی (وی)یش دابنێـین ١٣٠٦ دەردەچێـت. ئەمە وێـڕای ئەوەی لەڕووی وەزن و مانـا و ڕێزمانیشـەوە هەڵەیە. لە نوسخەی (کف)یشدا ئەو دێڕە بە هەڵە نووسـراوە و بەم شـێوەیە: (جـان وی تحـت اللـواء المرسلین). ئەمەیش کێشەکە قـووڵتر دەکـاتەوە، چـونکە (اللـواء) نابێـت ئەلـف و لامـی

بچێتە سەر، لەبەرئەوەی (مضاف)ە. ساڵەکەیش دەکاتە ١٣٦٧ کە لەگەڵ بەڵگەکانی تردا یەک ناگرێتەوە کە دواتر دەیانخەینە ڕوو. لەژێر ئەو دێڕەیشدا لە هەمان نوسخەدا بە فارسی نووسراوە: ئەمە بۆ مێژوو نووسراوە بەڵام هەڵەیە. لە چاپەکەی (مع)دا ئەو دێڕە بەم چەشنە نووسراوەتەوە: (جان وی تحت لواء المرسلین) "١٣٣٧". گومانی تێدا نییە کە لەڕووی واتا و وەزنەوە ئەمە ڕاستترینە، بەڵام ناکاتە ١٣٣٧، بەڵکو دەکاتە ١٣٣٦. هەریەک لە چاپەکانی حەمید موستەعان و حەسەن گۆرانیش بەم چەشنە نووسیویانە: (جان وی تحت الواء المرسلین) کە دەکاتە ساڵی ١٣٣٧.

دوو بەڵگەی تر لەبەر دەستدان کە دەیسەلمێنن ساڵی مردنی تاهیر بەگ ١٩١٨ز. بووە کە بەرانبەر بە ١٣٣٧ دەوەستێتەوە. یەکەمیان لەو بەرگە دەستنووسەی کە لە ماڵی حەسەن فەهمی بەگدا هەیە، نووسراوە: مەرحووم جەننەتمەکان، شاعیری بەناوبانگ تاهیر بەگی کوڕی عوسمان پاشای جاف لە تشرینی سانی ١٩١٨دا وەفاتی کردووە. مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٨ کە مانگی ١١ی زایینییە، بەرانبەر بە مانگی سەفەری ١٣٣٧ دەوەستێت. بەڵگەی دووەمیش ساڵی ژنهێنانی ئەحمەد موختار جافە کە دەگوترێت ساڵی ١٩١٨ز. چەند مانگێک بەر لە مردنی تاهیر بەگ ژنی هێناوە. (چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی هەڵەبجە، ٢٠١١: ١٧١) ئەم دوو بەڵگەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە دەبێت ئەو ڕستەیە بەم شێوەیە نووسرابێت: (جان وی تحت الواء المرسلین) بەڵام بە هەڵە تۆمار کرابێت و ئەوانەی دیوانەکەیان ساغ کردۆتەوە پەییان بەم هەڵەیە بردووە و بێ ئاماژەبۆکردن لای خۆیانەوە ڕاستیان کردبێتەوە. کێشەیەک کە لەم خوێندنەوەیەدا دەمێنێتەوە، وەزنەکەی و ماناکەیەتی. وەزنەکەی بەم شێوەیە لەنگ دەبێت و ماناکەیشی ناتەواوە. دەکرێت بە زۆرلەخۆکردنەوە مانایەکی بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام وەزنەکەی بە هیچ شێوەیەک ڕێک نابێتەوە. ئەگەر وشەی (الواء) بە (الوأي) لێک بدەینەوە بە واتای پەنا، ماناکەی ڕێک دەبێتەوە، ئەو دەمە بۆ ئەوەی حیسابە ئەبجەدییەکە ڕاست دەرچێت دەبێت ناچار بین بە شێوەی

(تەحتەلوئی) بيخوێنينەوە، ئەو دەمەيش ئەلف و لامی مورسەلين دەبێت لابېرێت. بە گشتی وا دەردەکەوێت ئەو کەسەی مێژووەکەی نووسيوە، يان عەرەبيی باش نەزانيوە، يان حيساباتی ئەبجەديی نەزانيوە. ئەمەيش زۆر بەدوور دەزانرێت لە سڵێمان بەگی باوکی گۆران. بەم پێيە رەنگە ئەو بەيتەی کۆتايی هی سڵێمان بەگ نەبێت و نوسخەنووسێک کە ئاگای لە مێژووی مردنی تاهير بەگ بووە، لە خۆيەوە زيادی کردبێت. گريمانەيەکی تری لاواز ئەوەيە کە رستەکە بەم شێوەيە بووبێت (جان وی تحت لواء المرسلين) بەڵام لەبەرئەوەی دەکاتە ١٣٣٦، نووسەر، يان نووسەرەوە بۆ رێککردنەوەی مێژووەکە ئەو ئەلفەی زياد کردبێت و چاوپۆشيی لە وەزن و مانا کردبێت.

# دەستنووسەکانی دیوانی تاهیربەگی جاف

## دەستخەتی شیعرە فارسییەکانی تاهیربەگی جاف «کم»[1]

ئەم دەستنووسە دەستخەتێکی زۆر نایاب و خەتخۆشە. سەرەتا ئەم دەستنووسە دەستنووسێکی تەواو و ڕێکوپێک و موجەلەدکراو بووە. لە بەشێک لە دیوانی سالمدا شتێکمان لەبارەی ئەو دەستخەتەوە گوتووە. دواتر کە شیعرە بڵاونەکراوەکانی ئەحمەد موختاریشم چاپ کرد شتێکی زیاترم ڕوون کردەوە، ئەو پرسیار و گومانانەیش لەسەر ئەو دەستنووسانە بوو، سەلمێنران.

ئەم دەستنووسە (١٣×٢٠)سم، لە کتێبخانەی مەجلیسی شوورای میللیی ئێران لە شاری تاران پارێزراوە. ئەم نوسخەیە لەو کتێبخانەیەدا بەم شێوەیە پێڕست کراوە:

ژمارە: (٩٩٦٣-نن)، دیوان طاهر بگ، شمارە قفسە: ق ٩٧٩٠، لەلای ڕاستیشەوە نیشانەی شێر و خۆر و شمشێرێک هەیە، لە ژێری ئەمەیشەوە نووسراوە: شمارە ثبت کتاب: (٨٦٤٠١).

ئەم نووسینە پارچە کاغەزێکە لکێنراوە بە سەرەتای لاپەڕەی یەکەمی ئەم دەستنووسەوە، هەروەها لە لاپەڕەی دووەمی ئەم دەستنووسەدا چەند مۆرێک کوتراوە و مۆری کتێبخانەی مەجلیسی شوورایە. یەکێک لەو مۆرانە مۆرێکی شێوە هێلکەییە و مرەکەبەکەی سوورە و لە ناویدا نووسراوە: «کتابخانەی موزە و مرکز اسناد مجلس شورای اسلامی»، لە خواری ئەمەیشەوە ئەم ژمارەیە هاتووە: (٩٧٩٠). لە ژێری ئەمەیشەوە

---

١- ئەم بابەتە پێش چەند ساڵێک لە گۆڤاری ڕامان و دواتریش لە گۆڤاری باراندا بڵاو کراوەتەوە. ئێمە لێرەدا بە باشمان زانی بابەتەکە بەم شێوەیەی لێرەدا دەیبینی ڕێک بخەین. ئەو کاتەی ئەم بابەتە نووسرا و بڵاو کرایەوە، ئاگاداری هەموو چاپەکانی دیوانی تاهیر بەگ بووین، بەڵام هەر ئەم نوسخەیە بەپەلە و بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە نوسخە و نووسەر و بابەتی و پەراوێزنووسین و بەراورد، لەلایەن کامیل سەفەریان و زەهرا سەجادی، بە هەڵەیەکی زۆر و تێکەڵی لە شیعرەکان، نوسخەکەیان لە ئێران چاپ کرد و خستیانە بازاڕەوە.

نووسراوە: (فیلموتیک تاسیس ٢ ١٣).

مۆرێکی تری بچووکی لاکێشەیی لە نزیکی ئەم مۆرەوە هەیە و لەسەری نووسراوە: (بازرسی شد). لە ژێری ئەمیشەوە نووسراوە: (٣٧-٦). لە نزیکی ئەم مۆرەیشەوە مۆرێکی تر هەیە کە هەر مۆری کتێبخانەی مەجلیسە و لاکێشەییە بەم شێوەیە هاتووە: (بازدید شد). لە ژێری ئەمەیشەوە نووسراوە (١٣٨٤).

ئەم دەستنووسە کۆمەڵە دەستنووسێکە لە کتێبخانەی مەجلیسدا و یەک کەس نووسیویەتییەوە. هەرچەندە ئەم دەستنووسە ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە، بەڵام دیارە کە چەند دەستێکی دیوە و شوێن دەستیان پێوە دیارە و کاری خۆیان لەسەر کردووە. بەڵام لە چەند شوێنێکدا ساڵ هاتووە، ئەو ساڵانەیش لە جێگای خۆیاندا دەیانخەینە ڕوو.

ئەم دەستنووسە و هەموو ئەو بەشانەی تری، دەستنووسەکانی کتێبخانەی بنەماڵەی عوسمان پاشایە و بە دڵنیاییەوە دەڵێین کە هی کتێبخانەکەی ئەحمەدموختار بەگی جاف بووە، زۆریش لەوە زیاتر بووە کە لەلای ئێمە هەیە. ئەو بەشەی لەلای ئێمە هەیە هەموویان یەک کەس نووسیویەتییەوە ناوی سەیید عەلی بووە. لە چەند دەستنووسێکدا مۆری ئەحمەدموختار و ئیمزا و ناوی خۆی لەسەر نووسیوە، یان هەڵەکانی ڕاست کردووەتەوە و ئیمزای لەسەر کردووە. ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە کە ئەم دەستنووسانە ئەحمەدموختار دیویەتی و هی کتێبخانەکەی خۆی بووە و هەموویانی خوێندووەتەوە، ئەگەر نەخوێنرابێتەوە، ئەو هەڵانە چاک نەدەکرانەوە و بەو شێوەیە ئیمزای نەدەکردن.

ئەو دەستنووسانەی کە سەیید عەلی نووسیویەتییەوە:

١- دیوانی سالم.

٢- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی.

٣- دیوانی ئەحمەدموختار بەگی جاف.

٤- دیوانی تاهیربەگی جاف.

٥- دیوانی موستەفا بەگی کوردی، لەگەڵ چەند پارچە شیعرێکی دیکەی شاعیرانی تری کورددا.

٦- دیوانی نالی.

٧- کەشکۆڵە شیعری فارسی و کوردیی شاعیرانی کورد و فارس.

تاکو ئێستا ئەمانە ڕوون و ئاشکران، نازانین دوابەدوای ئەمە چیی تر دەردەکەوێت. ئەوەی تاکو ئێستا لەلای ئێمەیە و دیومانە و بەراوردمان کردوون، ئەم کۆمەڵە بەرهەمەن کە ناومان هێنان و بە خەتە نایابەکەی سەیید عەلی نووسراونەتەوە.

با بێینەوە سەر باسی ناوەڕۆکی دەستنووسەکە. ئەم دەستنووسە چەند خاسییەت و تایبەتمەندییەکی هەیە، یەکێک لەوانە ڕیزبەندیی شیعرەکانە بەپێی ڕیزبەندیی پیتەکان لە ئەلفەوە تا یاء. ئەوەی جێگەی دڵگرانییە پیتی ئەلف لەم دەستنووسەدا فەوتاوە و تەنیا یەک بەیت لە پیتی ئەلف ماوەتەوە. ئەمەیش مانای ئەوەیە کە پیتی ئەلفی تێدا بووە، نیشانەیەکی تریش بۆئەوەی کە پیتی ئەلف لەم دەستنووسەدا هەبووە، ئەو ژمارەیەیە کە خودی نووسەر لەسەری نووسیوە، ئەو ژمارەیش کە ئێستا ماوە و لەسەر لاپەڕەی (١)ە، ژمارە (١٧)یە، کەواتە ١٦ پەڕەی نەماوە، ئەو ١٦ پەڕەیەیش خوا خۆی دەزانێت چیی بەسەر هاتووە و چەند پارچە شیعری تێدا بووە.

سەرەتای دەستنووسەکەیش بەم بەیتە شیعرەی دواغەزەل لە پیتی ئەلف دەست پێ دەکات:

طاهر جنونی تا بە کی نشنیدەای در قید کرد؟
زنجیر تار زلف او پای دو صد دیوانە را

لە دوای ئەم بەیتەوە دەچێتە سەر پیتی بێ، لە دوای ئەم نیوەبەیتەیشەوە (یارم ز در درآمد با روی بی حجاب) پچڕان لە نوسخەکەدا هەیە و دوو ژمارەی هەیە، لاپەڕە ٢ و ١٨ و لە بەرانبەریشدا لاپەڕە ٣ و ٢١ نووسراوە. کۆتاییی شیعری (یارم ز در...) فەوتاوە. لە

لاپەڕەکەی دواتریدا دوو بەیتی کۆتاییی شیعرێکی ترە و بەم شێوەیەیە: (بی‌خبر بودم کە دل افتادە انـدر دام عشـق) کـەچی کاتێـک ئـەم نوسـخەیەیان چـاپ کـردووە، ئـەو شـیعرەی کۆتاییەکەی نەماوە و ئەم دوو بەیتە کە کۆتاییی شیعرێکی ترە تێکەڵی کردووە و بە یـەک شیعری لەقەڵەم داوە.

چەند شیعرێک لەم نوسخەیەدا هەیە و پێشتریش بڵاوکراونەتەوە، هەندێک جیـاوازیی وشەییان لەگەڵ یەکتردا هەیە، هەندێکیشیان لەڕووی بەیتی زیـاد و کەمـەوە، جیاوازییـان هەیە. بۆ نموونە: (زلفین تو کە طعنە زن مشک و عـنبرند) لێرەدا کە لاپـەڕە ٥٤ی کـۆن و لاپەڕە ٧٢ی تازەیە کە پێ دەچێت بە خەتی پێڕستنووسی مەجلیس نووسـرابێت، یـان ئـەو حەسەن ناوەی کە ئیمزای لەسـەر کـردووە، یـان ئـەو عەلییـەی کـە چەنـد پارچـە شـیعری نووسیوەتەوە و ئیمزای کردووە. دەکرێت ئەم عەلییە هـەر عـەلی کـەمال بـاپیر بێـت، یـان کەسێکی تر بووبێت و دوای کـەمالی دەسـتخەتەکەی کەوتبێتـە دەسـت. بەهـەرحاڵ دوو ژمارەی بۆ دانراوە. بە قەڵـەمی ڕەسـاس سـێ بـەیتی شـیعری فیردەوسـی نووسـراوە، دواتـر نووسراوە (دە هم ماە صفر نویشتە شد من نمانم، خط بماند یادگـار، سـنە ١٣٣٥. حسـن [ئیمزا]). ئەم حەسەنە و ئیمزاکـە دوو نـاوە، ناوەکـەی بـاوکی ناخوێنرێتـەوە و هـەردووکی کراوەتە ئیمزا. سەرتای پیتی (ڕ) بە خەتی سەیید عەلی دەست پێ دەکاتەوە.

پیتی کاف و گاف لەم دەستنووسەدا نەهاتووە، یان فەوتاوە، ئەوەیان نازانین. شـیعری (ز آن نظر کند همە دم روبر آینە) کۆتاییەکەی فەوتاوە، لێـرەدا چەنـد لاپەڕەیـەکی کـەوتووە و نازانین چەندە. هۆی ئەم کەوتنەیش ڕوون نییە، لەگەڵ ئەوەیشـدا سـەرەتای پیتـی یـائیش نەماوە و دیار نییە چەند پارچەیش لە پیتی یاء لەناو چووە. ئەوەی لە پیتـی یـاء ماوەتـەوە چەند پارچە شیعرێکە و کۆتاییی شیعرێک و چەند شیعرێکی تری کە بەدوای ئەودا دێـت

ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە شیعری پیتی یاء زۆر بووە، بۆ نموونە کە ٧ لاپەڕە نەماوە، ئەمەیش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت.

**خواجە گر قهر کند بندە نباشد دلگیر**

**شاد شود طاهر اگر یار نماید عقبی**

دوای ئەم بەیتە، چەند غەزەلێکی لە پیتی یاء دێنێت. لە یەک دوو لاپەڕەی دواتردا بە خەتی عەلی ناوێک، ئیمزایەک کراوە و باس لە کارێک دەکات کە سەبارەت بە ئەحمەد موختار جافە و تێک دراوە، هەروەها لە لاپەڕە ١٢٢ بەرانبەر بە ١٤٨ چەند نووسینێکی کەمی تێدا نووسراوە و نووسیویەتی:

**(ترسم کە من بمیرم و یاران بی‌وفا**

**پا بر سرم نهند ندانند کیم)**

بۆشاییەکی چەند سانتیمەتری لێرەدا هەیە و دواتر ئەم دوو بەیتە نووسراوە:

**(ترسم کە من بمیرم و غم بی‌پدر شود**

**وین طفل نازپرور من دربدر شود)**

لە نێوان ئەم دوو بەیتەوە لە لای چەپەوە دووجار عەلی ئیمزای کردووە بەم شێوەیە:

علی [ئیمزا]

علی [ئیمزا]

هەروەها لە لاپەڕە ١٣٩ بەرانبەر بە ١٢٣ دوو بەیتی تر بە قەڵەمی ڕەساس هاتووە، یەکیان هی سائیبە و ئەوی تریان نازانین هی کێیە. دواتر دووبەیتی تری فارسییش لە خوارەوە و لە لای چەپەوە نووسراوە و ئیمزای عەلی لەسەر کراوە.

دوای ئەم شیعرە نووسراوە: (طاهر بگ دام اقباله...) دواتر شیعری «تا بەکەی قوربان» هاتووە، لەدوای شیعری (چو دلبر با رقیبان بادە در پیمانە می‌ریزد)ەوە، شیعری «ئەم کەوا تاقی سەمەن ساقە» هاتووە و لە دیوانەکەدا نییە. لە لاپەڕەکانی کۆتاییی ئەم

دەستنووسەدا نووسراوە: «تم تم تم تم». لە لاپەڕەکەی بەرانبەریدا ئەم چەند بەيتە بە خەتی ئەحمەد موختار جاف نووسراوە:

(گويند بە شب ديدن آيينە نکو نيست
ما روی تو در موی تو ديديم نکو بود)

***

(تا تو نگاه میکنی کار من آه کردنست
ای بە فدای چشم تو! اين چە نگاه کردنست؟)

***

(سگ کوی تو بە بوی دل ما میآيد
سگ اويم کزو بوی وفا میآيد)

پاشان ئەم چەند دێڕە نووسراوە: (در سنە هزار و سيصد و سی و چهار[1] در ايام سفر[2] برلک برای يادگار نوشتە شد، من نمانم خط بماند يادگار آە آە، ١٣١٤ خانا پاشازادە، احمدمختار جاف [ئيمزا].)

لاپەڕەی کۆتايی ئەم دەستنووسەی سەييد عەلی، بەم شيعرەی خوارەوە کۆتايی دێت:

بنوارە لە ئەم نەشئەيی ئەمڕۆ لە دڵايە
هەر لايێ دەچی دەم لە دەم و دەس لە ملايە
دوو بيستی من ئەمڕۆ وەکو پەنجا لە چلايە
بەم نەوعە خودايا کە بڕۆم، بچمە چ لايە؟

ئەم دوو بەيتە چونکە لە نێوان شيعرەکانی تاهير بەگدا نييە و لە کۆتايی

---

١- لە دەستنووسەکەدا نووسراوە (سيوچوار) و هەڵەيە.

٢- لە دەستنووسەکەدا وشەی (صفربرلک) بە هەڵە نووسراوە.

نووسینەکەی ئەحمەدموختارەوە هاتووە، دەکرێت گومانی لێ بکرێت کە شیعری تاهیر بەگ بێت، دوای لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەوت شیعری حەمدیی شاعیرە.

شیعرەکانی نێو ئەم دەستنووسە بریتین لە ١٢٠ پارچە شیعر، بەڵام لە ڕاستیدا دەستنووسەکە و شیعرەکانیش زۆر لەمە زیاتر بوون، تەنها ئەوەندەی ماوەتەوە. دەبێت ئەوەیش بڵێین کە هەموو هۆنراوەکانی ناو دەستخەتەکە بڵاونەکراوە نین، ئەو شیعرانەی کە لەم دەستنووسەدا بڵاوکراونەتەوە ١٤ پارچە شیعرن، ئەم شیعرە بڵاوکراوانە لەگەڵ ئەوانەی دەستنووسەکەدا جیاوازیی زۆریان هەیە، چ لە ڕووی وشەیی و چی لە ڕووی زیادی و کەمیی بەیتەکانەوە.

جۆری خەتی ئەم دەستنووسە نەستەعلیقە. ئەو لاپەڕانەی ماوەتەوە بریتین لە ١٣٨ لاپەڕە، لە لاپەڕە ٣ی دەستخەتەکەدا لە سەرەوە دوو دێڕ نووسراوە: (این کتاب به دوست دانشمندم جناب آقای مراد اورنگ تقدیم می‌شود. عبدالحسین (میمنت!)... ئیمزا)، دواتر ئەم ڕێکەوتە نووسراوە: (٧-١٠-٤٨).

## دەستنووسی ڕەشنووسی دیوانی تاهیربەگی جاف بە پێنووسی خۆی (تا)

ئەم دەستنووسە کە بە دەستنووسی دیوانی تاهیربەگی جاف بە پێنووسی خۆی ناساندوومانە، یەکێکە لەو دەستنووسە گرنگانەی بەردەستمانە کە سوودی زۆری لێ وەرگیراوە، بۆ شیعرە فارسییەکانیش بە دەستنووسی بنچینەیی دانراوە.

لەم نوسخەیەدا کە بە خەتی خودی شاعیرە، سەرەتا و کۆتاییی فەوتاوە، نازانرێت چەندێک لە سەرەتاوە فەوتاوە و کۆتاییەکەیشی چەند بووە و چەندی فەوتاوە. لەوەی ماوەتەوە نزیکەی ١٢٦ پارچە شیعری فارسیی ماوەتەوە و هاتووە، قەبارەکەی لە (١٤×٢١سم)ە، موحەممەد عەلی قەرەداغی لە ناساندنی ئەم دەستنووسەدا دەڵێت: «یەکێکە لەو دەستخەتانەی مامۆستا ئیسماعیل سپیندارەیی کۆی کردوونەتەوە و ماوەی

سـوود لێـوەرگرتنی دام، پ: (٢١×١٩)، ل: ٦٣، ن: ؟، س: ؟. (ئـەلبوومی کەشـکۆڵ: ٢١٧، ٢٠٠٨) ئەم ئەندازەیەی ناویراو داینـاوە گومانمان لێی هەیە و دەبێت بەو شێوە بێت کە ئێمە دامان ناوە.

لەسەر کاغەزێکی زەرد و بە خەتێکی تا ڕادەیەک نـاخۆش نووسـراوەتەوە، زۆر شـوێنی فەوتاوە، پووکان و ڕزین لە سەرەتاوە تا کۆتایی لـەم دەستنووسـەدا ڕووی داوە و دەبینرێـت، جوان هەڵنەگیراوە. خـودی شـاعیر زۆر شـوێنی گۆڕیـوە و کوژانـەوە و نووسـینەوەی زۆری تێدایە. جگە لەوەیش زۆر شیعری تێدایـە بـە بۆچـوونی ئێمـە شـاعیر یـان تەنهـا قـاڵبی شیعرەکەی داناوە، یان فیکرەکـەی دارشـتووە و کـێش و سـەرواکەی دروسـت نەکردووەتـەوە، ئەمەیش بەپێی ئەو شیعرانەی هەندێک جێگا نیوەی یەکـەم وەزنـی تـەواوە و مانـا تـەواو نییە، نیوەکەی تری مانا تەواوە و وەزنەکەی تەواو نییە، یان هەر لە مانا و وەزندا تەواو نین.

ئەم دەستنووسە لەگەڵ ئەو نوسـخەیەی کەمالیـدا یـەکێکن و ئـەوەی کـەمالی لەبـەر ڕۆشنایی نوسخەکەی تاهیر بەگ خۆیدا نووسراوەتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی لە زۆر جێگـادا شیعرەکان وەکو یەکن. لە هەندێک شیعردا جیاوازییان تێدا نییە و لە هەندێک شیعریشـدا کەمترین جیاوازییان تێدایە. جیاوازیی ئـەم دەستنووسـە ئەوەیـە خـەتی خـودی شـاعیرە، بەشێک لەو شیعرانەی لە نوسخەکەی کەمالیدا فەوتاوە لێـرەدا بەشـێکی زۆری مـاوە، یـان ئەو شیعرانەی سەرەتاکەی یا کۆتاییەکەی فەوتاوە، لێرەدا ماوە و لە شوێنی خۆیدا ئامـاژەی پێ کراوە.

لەم دەستنووسەدا ناوی هیچ کەسێک نەهاتووە، ساڵی نووسینەوەی پێوە نییە، بەڵام بـە چاوپێدا خشانێک دەردەکەوێت کە ئەم دەستنووسە هی تاهیربەگی جافە و بە قەڵەمی خۆی نووسراوەتەوە؛ چونکە لە زۆر جێگادا کوژانەوە، ڕێکخستنەوە، بەیت بۆ زیادکردن، نیوەبـەیت ڕاستکردنەوە و چـاککردن، غـەزەل کوژانـەوە ڕووی داوە و دەبینرێـت. ئـەم نوسـخەیە وەکـو

گوتمان لەبەر ئەوەی نوسخەی ڕەشنووسە، هەڵە و کەموکورتیی زۆری تێدایە، لەبەر ڕۆشناییی نوسخەکەی کەمالی و چاپکراوەکان و نوسخەکانی تری، بەراورد کراوە و تا ئەو جێگایەی توانرابێت گرفتەکان چارەسەر بکرێن، چارەسەر کراون.

**دەستنووسی مەلا ئەحمەدی دەککەیی «دک»**

ئەم کەشکۆڵە یەکێکە لەو کەشکۆڵانەی لای موحەممەد عەلی قەرەداغی و لە کتێبی ئەلبوومی کەشکۆڵدا، لە لاپەڕە ١٧٨دا ناساندوویەتی. نوسخە ئەسڵییەکەی لەلای ناوبراوە و ئێمەیش کۆپییەکی وێنەگیراویمان لێی وەرگرتووە.

ئەم دەستنووسە پڕیەتی لە دوعا و شیعری کوردی و فارسی و عەرەبی و... هۆنراوەی شاعیرانی کورد و فارسی تێدا دەبینرێت، شیعری شاعیرانی کۆن و نوێی تێدایە.

کەشکۆڵەکە زۆر شپرزە بووە و باش هەڵنەگیراوە، لە زۆر جێگەدا ئەوەندە مۆرانە خواردوویەتی یان دڕاوە، پارچە هۆنراوەکە یان نووسراوەکە فەوتاوە و ناتوانرێت بخوێنرێتەوە و کەڵکی لێ وەربگیرێت. لەبەر ئەوەی زۆر شپرزە بووە و تێک چووە بە کەڵکی ئەوە نایەت لە هەموو جێگەیەکدا سوودی لێ وەربگیرێت، هەر بۆیە ناوبەناو و ئەوەی پێویست بە ساغکردنەوە بکات و ساغ بکرێتەوە، بەپێی توانا لێی ساغ دەکەینەوە و بڵاوی دەکەینەوە. لەم بەهەمەی تاهیر بەگدا لە هەندێک جێگادا سوودی لێ وەرگیراوە.

مامۆستا موحەممەد موستەفا (حەمەبۆر)ی بەڕێزیش ماوەیەک ئەم کەشکۆڵەی لەلا بووە و شیرازە و پینەکاریی کردووەتەوە و پێشەکییەکی دوورودرێژی بۆ نووسیوە. حەمەبۆر لە دووەم لاپەڕەدا هەندێک زانیاریی لەسەر کەشکۆڵەکە نووسیوە، پێم وایە ئەو کاتەی کە لە شاری بەغداد نیشتەجێ بووە زانیارییەکانی نووسیوەتەوە. هەر لە دووەم لاپەڕەدا نووسراوە: بەغدا- لە کۆتاییی ١٩٨٦ و سەرەتای (١٩٨٧ز)دا.

بەرگی ئەم دەستنووسە جلدێکی ڕەنگ سەوزی مامناوەندییە و لێوارەکەی ڕەنگی قاوایییە، بە قەڵەمی جافی شین بە گەورەیی لەسەری نووسراوە: «کەشکۆڵی مەلا ئەحمەد دەککەیی».

بەپێی ئەو وێنەیەی کە گیراوە، دەردەکەوێت کە پێوانەکەی (١٢×٢٠سم)ە یان (١٤×٢١سم)ە، ئەوەی لێی ماوەتەوە ٣٠٠ لاپەڕەیە. لە ساڵی ١٣٤٦ی کۆچی بەرانبەر بە ساڵی ١٩٢٧ی زایینی لە شاری هەڵەبجە دەستی بە نووسینی کردووە. پەڕەی یەکەمی بە قەڵەمێکی ڕەساس هەندێک نووسینی لەسەر نووسراوە و دوو مۆری مامۆستا قەرەداغیی (محمد علی قەرەداغی) پێوەیە. لاپەڕەی دووەمی بە قەڵەمی مامۆستا حەمەبۆر بە مەرەکەبی ڕەش و لێواری نووسینەکە بە قەڵەمی مەرەکەبی سەوز سێبەری بۆ کراوە، نووسینەکە بە گەورەییە و لەسەر لاپەڕەکە نووسراوە:

«کەشکۆڵی مەلا ئەحمەدی دەککەیی، ١٩٢٧ز- لە (١٩٦٧ز)دا لە دەراوی سیروان نووسراوەتەوە. خەتێکی بەژێردا هێنراوە هی مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداخییە، دوو خەتی بەژێردا هێنراوە، پینەکاری و شیرازە و بەرگ و لەسەرنووسینی لە لایەن موحەممەد موستەفا (حەمەبۆر)ەوە کراوە، لە بەغدا- لە کۆتاییی ١٩٨٦ و سەرەتای ١٩٨٧ز دا».

پاشان دەچێتە سەر پێشەکییەکەی حەمەبۆر و ناوەڕۆکی دەستنووسەکە. هەرچی شیعری تێدایە بەگوێرەی زانیارییەکانی ئەو دەمە نووسراوە کە بڵاوکراوەتەوە یان بڵاو نەکراوەتەوە. دواتر ئیندێکسێکیشی بۆ کراوە. دوای ١٦٦ لاپەڕە چەند پەڕەیەکی خاڵی دێت، ئنجا دەچێتە سەر کەشکۆڵەکە. ئەم پەڕانە دەفتەرێکی هاوشێوەی کەشکۆڵەکەیە و لەلایەن مامۆستا حەمەبۆرەوە دروست کراوە و لکێنراوە بە کەشکۆڵەکەوە.

شیعری نێو ئەم کەشکۆڵە، بریتییە لە شیعری شاعیرانی کورد بە زمانی فارسی و کوردی و... هەروەها شیعری شاعیرانی فارسیشی تێدایە؛ هۆنراوەی شاعیرانی وەکو خانا،

مەولەوی، مەحروومی، مەلا وەڵەدخان، تاهیر بەگ، ئەحمەد بەگ، نالی، سالم، کوردی، پیرەمێرد، بێخود، بێدار، ئەدەب، قادر سنە، موزنیب، مەولانا خالید، موفتی زەهاوی، شێخ نەجمەددین، سەلام، شێخ ڕەزا، مەلا حەسەنی قازی، سەرعی و... تێدایە.

شیعری شاعیرانی فارسی وەکو بیدل، وسووق ئەلدەولە، خواجە ڕوکنەددین، سەیید موبارەکشا، بابا (سەودای)، ئەحمەد شای قاجار، ئەبولحەسەنی خەرەقانی، سەعدی، شەمس، غەیاسی، جامی، حافز و... تێدایە.

دوای تەواوبوونی کەشکۆڵەکە، حەمەبۆر کۆتایینامەیەکی لە پەڕەیەکدا بۆ نووسیوە، چەند پەڕەیەکی سپی لە دوای کۆتایینامەکەوە هاتووە و ئیتر دەستنووسەکە تەواو دەبێت.

ئەو شیعرانەی تاهیر بەگ کە لەم دەستنووسەدا هاتوون، بریتین لە: داستانی قومار، مەربووتە حەیاتم، قوربانی ڕوخت بم، دڵ نەخۆشی دەردی، تیری غەمزە، دونیا هەموو لەحزە، دڵ لە هیجرت، نەماوە شاری هارووت، موقەددەر گەر نەبێ، سلام ما، چەمەن یەکبارە و...

هەروەها شیعرەکانی سلێمان بەگی باوکی گۆرانی شاعیریش کە بۆ تاهیر بەگ نووسراوە، لێرەدا هاتووە. جگە لەوەیش شیعری بە غەمزەی چاوی مەخمووری کە گوایە ناری و تاهیر بەگ پێکەوە نووسیویانە، لەم کەشکۆڵەدا بە ناوی نارییەوە هاتووە. ئەم دەستنووسە بە نوسخەی «دک» لەم دیوانەدا ناسێندراوە.

## کەشکۆڵی کفری «کف»

ئەم کەشکۆڵە بریتییە لە دەستنووسێکی گەورە و لە شاری کفریدا نووسراوەتەوە. ئەم دەستنووسە کۆپییەکی لەلای هەردەوێڵ کاکەییە و ئێمەیش نوسخەیەکمان لەبەر گرتووەتەوە، تا سوودی لێ وەربگرین.

ئـەم دەستنووسـە قەبارەکـەی (١٧×٢٣سـم)ە، نزيکـەی ٦١٤ پەڕەيـە و بـە خـەتی نەستەعليق و ڕوون و جوان نووسراوەتەوە؛ نزيکی ٢٥ پەڕەی سەرەتای کەوتووە. نووسـەرەوەی دەستنووس لە چەند جێگەيەکدا ناوی خۆی نووسيوە. نووسەرەوە لـە پـەڕەی ٥٤دا دەڵێـت: تەواوم کرد لە بيست [و] يەکی زيلحجەدا لە ئەحواڵی دڵ نارەحەتييا، لـە تـاريخی ١٣٤٩ لە شەهری کفری، لە مزگەوتی گەورە، لە سوبحی جومعە لە سەعات دوو و نيم، لە ئـاخری بەهار، بۆ پياوی لار...

جگە لەوەی لـە چەنـد جێگـەيەکدا سـاڵی نووسـينەوەی نووسـيوە، لـە پـەڕەی ٨١دا نووسەرەوە دەڵێت: (علی يد الحقير فی جامع کبير، احمد المجنون، من بلد کفری فی يـوم الخميس ١٣٤٩).

لەم کەشکۆڵەدا شيعری شاعيرانی فارسی وەکو مەولانای ڕۆمـی، سـەعدی، جەننـەتی، جامی، خوسرەو، بێدڵ، زەوقی و... هەيە.

شيعری عەرەبی بەناوی ئيمامی ئەبوويـەکر و نـەعتی عـەرەبی و... لـەم کەشـکۆڵەدا دەبينرێت. داسـتانی سـوڵتان جومجومـە و چەنـد داسـتانێکی تـر کە خاوەنيـان نـەزانراوە هاتووە. شيعری شاعيرانی وەکو ميرزا عەبدولقادری پاوەيی، ناری، کەمالی، ئەحمەد بە گ، مەلا حەسەنی مەلای بيارە، شێخ حەسەنی عازەبان، شێخ ڕەزا (بەشێک لە ديوانەکەيەتی)، بەشێک لە ديوانی ئەحمەدموختار جاف، بەشێک لە ديـوانی نـالی، بەشـێک لـە ديـوانی تاهيربەگی جاف و چەندين شاعيری تر کە شيعريان لەم دەستنووسەدا بە کوردی و فارسـی و عەرەبی هاتووە و دەبينرێت. هەندێک شيعريشی تێدايە کە خاوەنيان نەزانراوە.

هەر لەم دەستنووسەدا شيعری (بەغەمزەی چاوی مەخمووری)يش بە سەروای «کـردم» هاتووە و بە ناوی کاکە حەمەی مەريوانييەوە تۆمار کراوە.

ئەو شیعرانەی تاهیر بەگ کە لەم دەستنووسەدا هاتوون، بریتین لە ٣٣ پارچە شیعری کوردی و فارسی کە ئەمانەی خوارەوەن:

لە دەوری پیری مەیخانە، سوپای مەعسییەت، سەد کە پاشا، ڕەفیقان گرفتاری، ڕۆژی تەرەب، زلف تو مشک، مەربووتە حەیاتم، ڕەفیقان تا، تن چو، بە زیبایی رخ، ساقیا برخیز، صادقانە با تو، دو صف ایستادە، حاش للّٰه، بە ستمها، فەسڵی خەزان، ئەی پرتەوی، سلام ما، گلبرگ تنا، قوربانی ڕوخت بم، چەمەن یەکبارە، موقەددەر گەر نەبێ، عیلاجی دەردی عەشق، دڵ لە حەسرەت، تابەکەی قوربان، دونیا کە هەموو، فیدای ڕوخساری ئاڵت، نموونەی ڕووی تۆیە، تیری غەمزەی چاوەکانت، یا ڕەسوولەڵڵا، دڵ لە هیجرت.

ئەم دەستنووسە شیعری بڵاونەکراوەی تاهیر بەگیشی تێدایە و یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی بەردەستمان و زۆر کۆمەکمانی کردووە لە ساغکردنەوە و دیاریکردنی زۆر جێگا کە لە نوسخەکانی تردا خراپ بوون، یان ناتەواو بوون. لە ڕێگەی ئەم نوسخەیەوە جێگا ناتەواوییەکان تەواو کراون. ئەم دەستنووسە بە نوسخەی «کف» لە دیوانی تاهیر بەگدا ناسێنراوە.

## کەشکۆڵستان «مح»

کەشکۆڵستان دەستنووسێکی تری بەردەستمانە بۆ ئەم بەرهەمەی تاهیربەگی جاف. ئەم دەستنووسەیش بریتییە لە بەشێکی کەمی دەستنووسێکی گەورە کە لە موحەممەد عەلی قەرەداغی وەرمان گرتووە. ئەم دەستنووسە ناوبراو ناوی لێ ناوە کەشکۆڵستان، چونکە پاشماوەی کۆمەڵێک دەستنووسە و پێکەوە شیرازە کراون.

ئەم نوسخەیە بە خەتێکی جوان لە تێکەڵەی شکەستە و نەستەعلیق نووسراوەتەوە. ئێمە بە نوسخەی «مح» لێرەدا ناساندوومانە. لەم بەشەی بەردەستی ئێمەدا شیعری شاعیرانی وەکو تاهیر بەگ، شێخ ڕەزا، سالم، شەهیدی، سەید بەها، ناسرەددین شا،

حەمدی و... تێدا دەبینرێت. نووسەرەوە لە جێگایەکدا نووسیویەتی: (تمت از جامع پادشا فی ید احمدی ١٣٤٧).

نووسەرەوەی نوسخە لە جێگایەکدا شیعری دووبارە و هەڵەی نووسیوە و چاکی کردووەتەوە و دەڵێت: (این شعر ظاهرا غلط است چونکه تکرار است).

ئەو شیعرگەلەی لەم دەستنووسەدا هاتوون ئەمانەن: شەماڵ یار نەدیت، چون نظر، خال بە گنج، ئەگەر بێت و بکا، یا ڕەسووڵەڵڵا، نموونەی ڕووی تۆیە، شەهەنشای، یاران فەرهادم، دڵ نەخۆشی دەردی، ئەی پرتەوی، دڵ لە حەسرەت، تابەکەی قوربان، فیدای ڕوخساری، موقەددەر گەر نەبێ، قوربانی ڕوخت بم و...

ئەم دەستنووسە چونکە بە مۆبایل وێنەمان گرتووە، تا ئەو جێگایەی لە یادمانە دەستنووسەکە چەند دەستنووسێک بووە و پێکەوە شیرازە کرابوون. ئەندازەیان لە نێوان (١٤×٢١سم) و (١٧×٢٣سم)دایە، ئەو بەشەی شیعرەکانی تاهیر بەگی تێدا هاتووە، بریتییە لە ١٧ پەڕە.

### دەستنووسی موحەممەد موستەفا کوردی «مم»

ئەم دەستنووسە لەسەری نووسراوە موحەممەد موستەفا کوردی و ئێمە نیشانەی «مم»مان بۆ داناوە. سەرەتا و کۆتاییی ناتەواوە، لە ناوەندیشەوە چەند جارێک پچڕان و لێ کەوتنی تێ کەوتووە و بەشێکی زۆری نەماوە؛ ئەوەی ماوەتە ١٧ لاپەڕەیە، ئەندازەکەی (١٣×٢٠سم)ە. بە خەتی موحەممەد موستەفا کوردی نووسراوەتەوە. بەشێکە لە شیعرە فارسییەکانی تاهیربەگی جاف و بەپێی بەراورد و لێکدانەوەی ئێمە، ئەم نوسخەیە لەبەر ڕۆشناییی نوسخەکەی کەمالی نووسراوەتەوە و شیعری ناتەواو و بڵاونەکراوە و ڕیزبەندیی شیعرەکان ئەوەمان نیشان دەدات کە ئەمانە لەبەر یەک نووسراونەتەوە.

خەتی ئەم دەستنووسە زۆر جوانە، بە خەتی شکەستەی نەستەعلیق نووسراوەتەوە. لە هەندێک جێگادا پەیڕەوی ڕیزبەندیی شیعرەکان کراوە، لە هەندێک جێگایشدا پەیڕەو نەکراوە، بەڵام وا پێ دەچێت بەهۆی تێکچوونی شیرازەکەوە ئەو تێکەڵاوییە ڕووی دابێت.ساڵی نووسینەوە و هیچ نیشانەیەکی تری لەسەر نییە تا زانیاریی زیاتری لەبارەوە بنووسین.

### دەستنووسی کەریم بەگی جاف «کب»

ئەم دەستنووسەمان لە دوکتۆر حەسەن جاف وەرگرتووە چونکە هی کەریم بەگی باوکیان بووە، هەر بە ناوی ئەویشەوە ناومان ناوە و بە ئاماژەی «کب» لێرەدا ناسێنراوە. ئەم دەستنووسە دوو بەرگە و قەبارەیەکی گەورەی هەیە، نزیکەی ١٢٠٠ لاپەڕەیە. ئەم دەستنووسە لە داهاتوودا چاپ دەکرێت.

نووسەرەوەی ئەم دەستنووسە شیعرە سۆرانییەکانی بەدوای یەکتردا هێناوە، دواتر هەورامییەکان و دواتر شیعرە فارسییەکانی هێناوە. ئەم دەستنووسە خەتی چەند کەسێکی تێدایە. شیعری شاعیرانی کورد و فارس و عەرەبی تێدایە، شاعیرانی وەکو مەولەوی، خانای قوبادی، شێخ ڕەزا، خاڵۆی مەولەوی، شاکەلی و عەتاری نەیشابووری و... تێدایە.

ئەم دەستنووسە قەبارەکەی (١٤×٢١سم)ە، بە خەت و ڕێنووسی جۆراوجۆر نووسراوەتەوە، وەک شکەستەی نەستەعلیق و ڕێنووسی نوێ. ئەم دەستنووسە لە بەشی شیعرەکانی تاهیر بەگدا لە لاپەڕە ٢٤٥دا ساڵێکی پێوەیە و نووسراوە: (١٣٥٥ بعد از ظهر، سلخ جمادی الآخره از دکۀ سرچم در خدمت حاجی عبدالقادر بگ بودم، المذنب احمد حمدی).

شیعرەکانی تاهیر بەگ لەم دەستنووسەدا زۆرن، ٥٥ لاپەڕەیان داگیر کردووە. هەر یەک لەو شیعرانەی کە تێکەڵاو کراوە، وەکو شیعری بە غەمزەی، شیعرەکەی ئەدەب، ئەوا لێرەیشدا هەر بەناوی تاهیر بەگەوە هاتووە، بەڵام وەکو لە شوێنی خۆیاندا باسمان کردووە و

ساغمان کردووەتەوە کە ئەو شیعرانە هی کێن، لێرەدا نەمان هێناون و بە شیعری تاهیر بەگی نازانین.

هەر لە لاپەڕە ٢٤٠دا و لەناو شیعرەکانی تاهیر بەگدا نووسراوە: لە غەڵەت چاککردن بێتاقەت بووم. ئەم ڕستەیە ئەوەمان پێ دەڵێت کە شیعرەکانی تاهیر بەگ زۆر دەستکارییان کراوە، یان ئەوەتا کە تاهیر بەگ نووسیویەتییەوە و کۆچی دوایی کردووە و شیعرەکان هەر بەو ناتەواوییە کەوتوونەتە بەردەست، یان ئەوەتا بەشێکی تەواو کراوە و بەشێکی تەواو نەکراوە. بەڵام بەپێی دەستنووسەکەی خۆی بێت، ئەوە شیعرە فارسییەکانی تەواو نەکردووە چونکە لە زۆر جێگەدا ئەوە بە ڕوونی دیارە کە فیکرە و داڕشتن و وەزنەکەی دیاری کردووە، بەڵام هەروا جێ ماوە. ئەم دەستنووسە قسەوباس زۆر هەڵدەگرێت، لەبەرئەوەی چاپ دەکرێت، هەر ئەوەندەی لەسەر دەنووسین.

## چەند دەستنووسێکی تر

### دەستنووسی کۆیە «کۆ»

لەنێو ئەو دەستنووسانەی بەردەستماندا چەند دەستنووسێکی تر هەیە چەند شیعرێکیان تێدا هاتووە، واتە لەو دەستنووسانەدا دوو سێ شیعر هاتووە، بۆیە لێرەدا بە کورتی لەسەریان دەنووسین. کەشکۆڵێک کە لە شاری کۆیە نووسراوە و لە کتێبخانەی گشتیی تاران پارێزراوە، بە کۆدی ژمارە (٥-٠٩٧٧٦) داخل کراوە و دەناسرێت.

شیعری یا ڕەسوولەڵڵا و (مخمس طاهر بیگ بر اشعار خالص پسر شیخ رضا "خداوندا") هاتووە. نووسەر بە خەتی شکەستە و نەستەعلیق نووسیویەتییەوە. ئەم دەستنووسە بە نیشانەی «کۆ» ناسێندراوە.

## جُنگ اشعار فارسی و کُردی «کش»

ئەم دەستنووسە دەستنووسی کەمالیی شاعیرە، یەکێکە لەو حەوت دەستنووسەی بۆ ئەحمەدموختاری نووسیوەتەوە و لە کتێبخانەی مەجلیسی شوورای ئیسلامی ئێران پارێزراوە، دەستنووسێکی گەورەیە.

شیعری شاعیرانی فارس و کوردی تێدایە، شیعری شاعیرانی کوردیشی بە فارسی تێدا دەبینرێت. شیعری سەعدی، غیاسی، خاکی، ناری، تاهیر بەگ، ئەحمەدموختار جاف، مەحوی، مەولانا خالید، زێوەر، حەریق و... تێدایە، دوو سێ شیعری تاهیر بەگی تێدا هاتووە: تن چو مو، مخمس بر کلام طاهر بگ. پێش ئەم شیعرە شیعرێکی عارفە و لەم شیعرەیشدا نازناوی شاعیر نەهاتووە، پێ دەچێت شیعری عارف بێت، کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: (یار من لالەرخ). هەروەها لەم دەستنووسەدا شیعری بەغەمزەی چاوی مەخمووری بە ناوی نارییەوە تۆمار کراوە و بە ڕەدیفی «کردم» هاتووە.

ئەندازەی ئەم دەستنووسە (١٤×٢١سم)ە، بە خەتی سەیید عەلی نووسراوە، سەیید عەلییش خودی کەمالیی شاعیرە. بە ژمارە ڕەفەی ٩٧٩١ داخڵ کراوە و ناسێندراوە، لە ڕێکەوتی ٩ی موەحەڕەمی ١٣٣٣ی کۆچی نووسراوەتەوە، لێرەدا بە ناوی «کش» ئاماژەی پێکراوە.

## کەشکۆڵی سۆزی نیشتمان «نج»

ئەم کەشکۆڵەیش هی نەجمەددین مەلایە و کۆپییەکی لە بنکەی ژین وەرگیراوە. نووسەرەوەکەی نەجمەددین مەلایە، بەڵام کەمالیی شاعیر نوسخەیەک یان زیاتری لەسەر نووسیوەتەوە. پێم وایە ئەم نوسخەیە بەپێی ئاماژەکان خەتی کەمالیی شاعیرە، لەم دەستنووسەدا بە کورتی ژیاننامەی تاهیر بەگ لەگەڵ شیعری «موقەددەر گەر نەبێ...»دا هاتووە، ساڵی ١٩٤٢ نووسراوەتەوە.

**ديوانی زێوەر «زر»**

ئەم دەستنووسەيش هەر هی نەجمەددين مەلايە، ئەم دەستنووسە لە كتێبخانەی گشتيی بەرلين پارێزراوە. لەم دەستنووسەدا بەيتێكی توركی و تەخميسێكی زێوەرمان لێ وەرگرتووە، ئەم نوسخەيە بە ژمارە «hs. Or. ١٠٨٧١» لە كتێبخانەی ناوبراودا پارێزراوە. ساڵی ١٩٤٢ نووسراوەتەوە. لێرەدا زۆر لەسەر ئەم دەستنووسەيش نانووسين.

چەند دەستنووسێكی ترمان بەكار هێناوە، ئەوانەيش يەک لاپەڕە و دوو لاپەڕە بوون، لەوانە: يەک دوو دەستنووس كە لەلای مامۆستا موحەممەدڕەشيدی ئەمينيی پاوەيين كە يەكێكيان هی شێخانی بيارەيە و دەستنووسێكی تر كە لە لای كاک عەبدوڵڵای حەبيبی بوو. بۆ ئەوەی ئەم باسە دووردرێژ نەبێتەوە، زياتر لەسەری ناڕۆين و لە كۆتاييی ديوانەكەدا وێنەی هەموويان دادەنێين.

كاروان عوسمان خەيات (ڕێبين)

٧-٨-٢٠٢١ تاران

## پیتی ئەلف

### ١[1]

قوربانی ڕوخت بم کە شکەستی بە قەمەر دا
حەیرانی لەبت بم کە ڕەواجی[2] بە شەکەر دا
هەر ڕۆژێ ئەدەی وەعدەیی وەسڵت نییە ئەسڵی[3]
کارت وەکو دونیایە هەر ئەمڕۆیە بە فەردا[4]
مەقسوودی لەسەر کوشتنی عوششاقی[5] زەعیفە
وەقتێ[6] کە دەکا خەنجەری تیژی بە کەمەردا[7]
هەر چەندە دەکەم سەعی، لەبەر خوێنی سریشکم
خاکێ نییە بیکەم بە هەوەس، گاهێ بە سەردا[8]
دڵ ڕۆیوە قوربان لە وجوودم بە خەیاڵت
دایم لە سەفەردایە ئەگەرچی لە حەزەردا

---

١- ئەم شیعرە لە نوسخەکانی (کف، کش، مح، دک و کب)دا هاتووە، تەنها لە نوسخەی (مح)دا ٦ بەیتە و لە هەموویاندا ٧ بەیتە، لە چاپەکانیشدا بڵاوکراوەتەوە. لە نێوان نوسخە و چاپەکاندا هەندێک جیاوازی هەیە و ئێمە نوسخەکانمان بەراورد کردووە. لە نوسخەی (دک)دا تەنها دوو بەیتی کۆتایی بە تەواوی ماوە و بەیتەکانی تر بە هۆی ڕزینی نوسخەکانەوە ناخوێنرێتەوە.

٢- کش، مح: ڕەواج.

٣- کف: هەر لەحزە ئەکەی وەعدەیی وەسڵ، دەی نییە ئەسڵی؛ مح: هەر ڕۆژێ ئەدەی وەعدەیی وەسڵت نییە ئەسڵی؛ کب: هەر لەحزە ئەدەی وەعدەیی نییە ئەسڵی. ئێمە ئەوەی (مح)مان بە دروستتر زانی و دامان نا.

٤- ئەم بەیتە لە (مح)دا کەوتۆتە بەیتی کۆتایی.

٥- کش، مح: عاشق.

٦- کش، مح: وەختێ.

٧- ئەم بەیتە لە (مح)دا دەبێتە بەیتی (٤).

٨- ئەم بەیتە لە (مح)دا دەبێتە بەیتی (٢).

نــاحەق نیــیە ناوەســتێ ئەگەر پــردی تەحەمــول
ســیروانی سرێشــکم کە ئەکــا[١] هــاژە لە ســەردا[٢]
مەیلــت هەیە تــاهیر! کە بپرســی لە بــرینم؟
بنــوارە[٣] کە ئەو شــۆخە چ تیــری لە جــگەر دا![٤]

١-کش، مح: دەکا.

٢-کب: ئەم بەیتەی پاش و پێش کردووە.

٣-کب: بڕوانە.

٤- ئەم بەیتە لە (مح)دا نەهاتووە.

## پێنج خشتەکیی تاهیر بەگ لەسەر غەزەلێکی شێخ ڕەزا [١]

**٢**

نەمـــدی کەڕەتێــک تــاقە نیگــاهێکی عەتــا کــا
بەم شـــــاهی و والاییــــــیە لــــوتفێ بە گەدا کــــا
لێــی دوورە کە یەک ڕەســـمی موســـوڵمانی ئەدا کــا
«ڕۆژێ نەبـــوو ئەو دڵـــبەرە بێـــڕەحمە وەفـــا کـــا
جـــارێ نەبـــوو ئەو کـــافرە شـــەرمێ لە خـــودا کـــا»

مـــن کوشـــتەیی چـــاوانم و چـــاوانی لە مـــن ون
دەرد و ئەلەمـــیش گشـــتی بەوە لـــێم بـــووە دوژمـــن
بـــۆ چـــاک و شـــەفاکردنی ئەم دەردە دەوا چـــن؟
«حەیـــرانن ئەتیبـــا لە عیلاجـــی مەرەزی مـــن
لـــــوقمانی ویســـــاڵی مەگەر ئەم دەردە دەوا کـــــا»

کـاتێکی کە پێـی نـایە ڕکێـف، تـاو لە خەمـی مـرد
ڕۆیشـــــت و خەم و فیکرمـــــی بـــــا دڵ لەگەڵـــــی بـــرد
ئێسـکی لەشـی مـن گشـتی لە ژێـر بـاری فیـراق ورد
«کـــارێ کە غەم و دەردی فیراقـــی بە منـــی کـــرد
ســـەرما بە هەتیـــو، بـــا بە دەواری شـــڕی ناکـــا»

---

١- گۆڤاری سروە، ١٥٢، ١٣٧٧: ٤٤-٤٥. ئەم پێنج خشتەکییەی تاهیر بەگ لە هیچ دەستنووسێکی بەردەستماندا نەهاتووە؛ تەنها لە (حس)دا هاتووە، ئەویش لە گۆڤاری سروەوە وەری گرتووە.

عاشـــق[١] کـــوژ و جەببـــارە بە دوو دیـــدەیی کەحلـــی
ســـەد حـــۆری ســـەری شـــۆڕە لەبەر قـــامەتی نەخلـــی
جێـــی فەخـــرە لەبـــۆ دەم، کە ببۆســـێ کەفـــی نەعلـــی
«دێـــوانەیە شـــەخسێ کە بە غەیـــری لەبـــی لەعلـــی
وەک شـــاهی ســـکەندەر تەڵەبـــی ئـــابی بەقـــا کـــا»

هیجرانـــی، گەلـــێ مـــوهلیکە بـــۆ بەنـــدە وەکـــو ســـەم
هەم ســـــینەیی ســـــووزانە و هەم دیـــــدەیە پـــــڕ نەم
زووخـــاو و خەمـــــی دووریـــــیە، خـــــۆراکمە هەر ژەم
«تـــاب و تەبـــی ئاتەشـــکەدەیی هیجـــری وەکـــو شـــەم
نێـــزیکە منـــیش واریـــدی ســـەحرایی فەنـــا کـــا»

تەنهـــا ســـەفەرم ڕێگەیـــی ئەو شـــۆخەیە، ڕێـــمە
زنجیـــری هەوای عەشـــقی ئەوە، دایـــمە لە پـــێمە
بەم حـــاڵەوە پـــێم ســـەیرە یەکـــێ دیـــکە لە جـــێمە
«لەم ڕێـــگەیە تەقـــدیری ئەزەل وابـــوو کە ئـــێمە
پامـــاڵی جەفـــا بـــین و ڕەقیـــب ســـەیر و ســـەفا کـــا»

---

١- لە (حس)دا نووسراوە (ئاشق)، لە هیچ نوسخەیەکی دەستنووسی شیعرە کوردییەکانی تاهیر بەگدا وشەی عاشق بە ئاشق نەهاتووە و هەڵەیە، ئێمە وشەکەمان گۆڕی و بە عاشق دامان نایەوە. لە چاپەکەی (کز)یشدا بە ئاشق هێناویەتی و هەر لە (حس) وەری گرتووە.

حەتتــا بە خەویــش دوورە لە مــن بچــمە کەنــاری
قەلبـــی ڕەقـــی وەک بەردە، نەرم نـــابێ بە زاری
تەخمـــیس و غەزەل زەڕڕەیەکـــیش نـــایە بەکـــاری
«گیـــان و دڵ و دیـــن، هەرسـێ دەکەم بەزل و نیســـاری
بـێ،[1] کـامی دڵـی مـن بە لەبـی لەعلـی ڕەوا[2] کـا»

عەشـــقی ڕوخـــی ئەو یـــارە منـــی کـــردووە نـــاتیق
چـــونکی کە ڕەزا شـــێخە و هەم شـــاعیری حـــازیق
تـاهیر گەلـێ پێـی خۆشـە قسـەی شـێخێکی سـادیق
«سـەر دانـێ لە ڕێـی عەشـق ڕەزا! لازمە عاشـیق
بـۆ یـاری سـەر و مـاڵ سـپەری تیـری قەزا کـا»

١- لە گۆڤارەکەدا ئەم وشەیە لەبیر کراوە.

٢- ئەم وشەیش نووسراوە (دەوا) و هەڵەیە.

## پیتی تێ

### ١[1]

نەمـــــاوە شــــاری بابــــل، چــــاهی هـــــارووت
لە کــوێ خوێنــدوویە ئەفســوون، چــاوی جــادووت
دەڵێـــــی[2] تـــــۆراوە قیـــــبلەی عاشـــــقانت
کە ئەمــــڕۆ کەچ بـــووە میحرابـــی ئەبـــرووت
وەکــــو مەرجـــانی ئـــاڵە ڕەنگـــی ئەشـــکم
لە تــــاو ڕوخســـار و لەعلـــی لێـــوی[3] یـــاقووت
مەکە مەنعـــم لە شــــەهدی لێـــوی ئاڵـــت
دەزانـــی خـــۆ کە نـــاژی کەس[4] بەبـــێ قـــووت
عەجەب ســـــیرێ لە ئەبرۆتـــــا بەیـــــانە
موخـــالیف پـــێکەوەن هەم تـــاق و هەم جـــووت
وەرە تــــــاهیر مەبەســـــتە دڵ بە دونیـــــا
بە زاهیـــــر جـــوان و، بـــاتین پیـــــر و فەرتــــووت

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، دک و کب)دا هاتووە، لە (دک)دا بەشی سەرەتای نوسخەکە ڕزیوە و تەنها دوو بەیتی کۆتاییی ماوەتەوە. لە چاپەکانیشدا هاتووە. لە هەموو نوسخە و چاپەکاندا ٦ بەیتە و هەندێک جیاوازی لە چەند وشەیەکی نێو دەقەکاندا هەیە.

٢- کب: ئەڵێی.

٣- کف: لێوی لەعلی.

٤- کب: کەس ناژی.

## پیتی ڕێ

## پرسیاری تاهیر بەگ لە ناریی شاعیر

۱[۱]

سوپاهی[۲] مەعسییەت وەک فەوجی بوڵغار
هوجوومی کردە سەر دڵ وا بە یەڵغار[۳]
سەفینەی نەفسی سووء بە تۆپی وەسواس[٤]
شکاندی قەلعەیی[٥] تەقوا بە یەکبار
سعوود کا گەر خەیاڵم تەرزی باڵۆن[٦]
سقووتی پێ دەکەن زوو سەر بەرەوخوار[٧]
لە شوومیی فەوجی حەربستانی نەفسم[٨]
مەجالی هیچ نییە، بۆ بانگ و هاوار

۱- ئەم غەزەلە تەنها لە نوسخەی (کف) و چاپی (کز)دا هاتووە، لە هەردوو نوسخەکەدا (۱۲) بەیتە و هەندێک جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە. هەروەها لەم دواییانەدا کاک سەباح مەلا عەبدوڵڵا لە ژمارە (۷۵ و ۷٦)ی گۆڤاری زرێبار (لا ۸۱)دا ئەم شیعرە و وەڵامەکەیشی لەگەڵ هەندێک شیعری بڵاونەکراوەی تری ناریدا بڵاو کردووەتەوە، هەندێک جیاوازی لەنێوان دەقەکەی بەردەستی ئێمە و کاک سەباحدا هەبوو، ئێمە هەردوو دەقەکەمان بەراورد کردووە.

۲- کف: سوپای.

۳- سەباح: بولغار.

٤- کز و سەباح: سەفینەی حەربی نەفسی توویی وەسواس. کز: سەفینەی نەفسی سوور بێت و بە وەسواس.

٥- کف: قوللەیی.

٦- کف: بالول، لە چاپی (کز و سب)یشدا نووسراوە (باڵۆن)، ئێمەیش ڕامان وایە کە (باڵۆن) بێت.

۷-کف: پێ دەدەکەن.

۸- کف: لە شەوقی قۆچی سەر بەستانی نەفسم.

شەیاتین ڕووسیا[1] وەک لەشکری ڕووس
خەیاڵی حەملەیانە[2] وەک سەگی هار
تەبیبانی هەموو یۆنان[3] ئەگەر بێن
مەحاڵە چاری دەردی نەفسی بیمار[4]
حەواسم وا پەرێشانە لە غەمدا
وەکو ئێران لە دەست ئاشووبی سالار
وجوودم وا زەلیلی دەستی نەفسە[5]
دەڵێی ڕووسە لە دەس[6] ژاپۆنی خوونخوار
هەوا و حیرس[7] وەک ئینگلیز و ئەڵمان[8]
دەکا تەسخیری[9] دڵ وا چاری ناچار
مەگەر سەرعەسکەری ڕۆمی[10] هیدایەت
بکا چارەی منی سووتاوی[11] غەمبار

---

١- سەباح: ڕووسیەهـ.

٢- کف: حیلەیانە.

٣- سەباح: تەبیبانێ هەموو بۆتان.

٤- کف: مەحاڵە دەردی نەفسی چاری بیمار.

٥- کز و سەباح: ڕووسە.

٦- کز و سەباح: دەست.

٧- کف: هەموو ئەو حیرسە.

٨- هەوا و حیرس وەک ئینگلیس و ئاڵمان.

٩- کف: یەخسیری.

١٠- کف: ڕۆحی.

١١- سەباح: سووتاو و.

وە یـــــا نــــــاری بە نـــــوتقی[١] مووشـــــکافی
عـــــیلاجم[٢] کـــــا[٣] بە تەدبیـــــر و بە گوفتـــــار
غەمـــــی تـــــاهیر دوو چەنـــــدانە ئەمێســـــتا[٤]
خـــــودا چـــــارێ، خـــــودا چـــــارێ، خـــــودا چـــــار!

**وەڵامی ناری بۆ تاهیربەگی جاف**

لـــــە بـــــەختم یـــــا لـــــە دەورەی چـــــەرخی دەووار
گـــــەلێ تـــــەشویشی حـــــاڵم بێتـــــە ئیزهـــــار
خـــــەیاڵم بـــــوو لـــــە دیوانـــــت ئـــــەدا کـــــەم
شـــــکاتی جـــــەوری ڕووســـــی نـــــەفسی غـــــەددار
کـــــەچی شـــــێوەی پەشـــــێوی خـــــەتتی خامـــــەت
لەســـــەر بـــــاری غـــــەمی دڵ بـــــوو بـــــە ســـــەربار
چ وەســـــفێ بـــــوو لـــــە عالەمـــــدا خودایـــــا!
دەبیـــــنم نـــــەفسی بولبـــــول زارە گـــــوڵزار
بـــــەیانی فەســـــڵی بـــــاب و داســـــتانم
مەقامێکـــــە دەمـــــێ خـــــاڵی لـــــە ئـــــەغیار

---

١-کز و سەباح: عەقڵی.

٢-کز و سەباح: عیلاجێ.

٣-کف: کات.

٤-کز و سەباح: نەمێستە.

وەهـــــا مـــــەغلوویی یۆنانـــــە گونـــــاهم
نموونـــەی لـــەوحی ڕوومـــە زوڵمـــەتی تـــار
هـــــەوا پێچایـــــەوە پێچایـــــە کـــــونجێ
ســـەحیفەی دەرســـی تـــەقوا تـــەرزی تۆمـــار
بـــە گوڵبـــاخی ئەلـــەم یـــەکبارە جـــەم بـــوو
لـــە کـــانی خورخـــوڕەی چـــاوم زرێبـــار
هوجـــوومی خـــەم لـــە بـــۆ مـــوڵکی حەواســـم
جیهانشـــا خاینـــە بـــۆ جـــاڕی بیجـــاڕ
فـــەرەنگی گـــەر برێـــژێ تـــازە نـــەقشێ
دەبـــێ ســـابت لـــە دڵ وەک نـــەقشی دیـــوار
وەلـــێ بـــۆ زەبتـــی ئـــاداب و هیدایـــەت
دەکـــا وەحشـــەت وەکـــو عاســـی لـــە ئـــەبرار
لـــە مـــەوجی بـــەحری عیســـانم دەکـــا ڕەم
لـــە قەتعـــەی ڕوبعـــی مەســـکوونا ســـەگی هـــار
نـــەبوو پیـــرێ بـــە قـــانوونی تـــەوەججوه
وە یـــا قـــوتبێکی ســـاحیب فـــەیزی ئەســـرار
وە یـــا شـــێخێ بـــە میزانـــی تـــەوەججوه
شکـــەستێ دا بـــە ڕووســـی نـــەفسی غـــەددار
هـــەتا (تـــاهیر) نـــەبێ لـــەوحی خـــەیاڵم
گـــەلێ ئیشـــکالە خـــۆ تـــەرتیبی ئەشـــعار

لـــــه بـــــۆ تەســـــکینی نـــــاری بێنـــــه پێشـــــۆ

خـــــودا کـــــاریّ، خـــــودا کـــــاریّ، خـــــودا کـــــار!

## ٢[١]

دڵ ئەوا دەرچوو لە سینە ڕاهی سەحرای گرتە[٢] بەر
هەر وەکو تەیرێ کە وەحشی بێ لە بەند دەرچێتە دەر
چەند تەلاشم کرد، نەگیرا ئاخری دەرچوو لە دەس[٣]
کەوتە سەحرای سینەسۆزان، دڵ فرووزان دەربەدەر
شەرتە ئەم دەفعە ئەگەر دەستم کەوێ بینێمە پێی
غولل و زنجیرێ لە مووی گێسوویی تورکی سیمبەر
چونکە دڵ لای خۆم نەماوە، تووخودا بەسیە عەزاب!
جاربەجار سەرپۆش لەسەر ڕووت هەڵگرە دەرخە قەمەر
زۆر دەخیلی بووم هەتا لایێ لە زوڵفی خستە دەر
پێی وتم: سەیر کە چلۆنم کرد لەبۆت (شق القمر)
قەددی دڵبەر چۆن بڵێم تەشبیهـ بە سەرو و عەرعەرە؟
سەرو و عەرعەر نەبووە قەت نارنج و بەی بێنێتە[٤] بەر
گەرچی ئەمڕۆ ڕۆژی چەژنە، خەڵق هەموو ئازاد ئەکەن
دڵبەری حیشمەت بە قەهرە، لای نییە سەرفی نەزەر[٥]

---

١- ئەم غەزەلە تەنها لە نوسخەی (مح و کف)دا هاتووە. لە (مح)دا لەسەری نووسراوە (تاهیر بەگ)، بەڵام لە هۆنراوەکەدا ناوی شاعیر نەهاتووە.

٢- مح: گردە.

٣-کف: دەست.

٤- مح: بێرێتە.

٥- ئێمە لە گۆڤاری (باران)ی ژمارە (٨)ی ساڵی سێیەم، ئابی (٢٠١٨)دا هەندێک شیعری تاهیر بەگمان خستۆتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، لەم دیوانەدا هەر شیعرێکمان ساغ کردبێتەوە کە هی تاهیر بەگ بوو بێت، لە جێگای خۆیدا ☜

☞ به بەڵگەوە خستوومانەتە ڕوو.

غەزەلی «دڵ ئەوا دەرچوو...» هۆنراوەیەکە حەکیم مەلا ساڵح لـە دەستنووسـێکی سـەیید بـاقری هاشـمییەوە وەری گرتووە و نەیگوتووە کە شیعرەکە بە دەستخەتی کێ نووسراوەتەوە. کاک ڕێبوار تۆفیق خۆیشی ئاماژەی بە دەستنووسێکی دوکتۆر شۆ دەکات، کە لە ساڵی (١٩٤١)دا نووسراوەتەوە و شیعرەکەی لەگەڵ دەقەکەی لای حەکیم مەلا ساڵحدا بـەراورد کردووە و بڵاوی کردووەتەوە.

ئەم هۆنراوەیە لە هیچ یەک لە دیوانە چاپکراوەکانی تاهیر بەگدا نەهاتووە. لەناو نوسخەکانی بەردەستی ئێمەیشـدا کە بۆ دیوانی تاهیر بەگ بە کارمان هێناوە، لە ناساندنی نوسخەکانیشدا بە نوسـخەی (مـح) ناومـان هێنـاوە و هـاتووە، لەسەر ئەم غەزەلە نووسراوە «تاهیر بەگ»، بەڵام لە هۆنراوەکەدا ناوی شاعیر نەهـاتووە. ئـەم کەشـکۆڵە لای مامۆسـتا موحەممەد عەلی قەرەداغییە و لەسەری نووسـیوە «کەشکۆڵستان. بەرگی یەکەم». ئەم کەشکۆڵە کۆمەڵێک پاشماوەی کەشکۆڵ و بەیاز و دەستنووسی ترە ماوەتەوە و پێکەوە لکێنراوە و کراوە بـە یـەک دەسـتنووس. ئـەوەی لـەم نوسـخەیەدا وەرگیراوە، بەشێکە لەو کەشکۆڵە و لە پەرەیەکدا نووسراوە: «تمت از جامع پادشا فی ید احمد س ١٣٤٧». ئەم ساڵەیش بەرامبەر بە ساڵی زایینی دەکاتە ساڵی (١٩٢٨)، هەروەها دواتر کە نوسخەی (کف)مـان تـاووتوێ کـرد، ئـەم شـیعرەمان کەوتە بەرچاو و لەسەری نووسراوە (وله سلیمان بگ عبداللّٰه بگ)، ئـەم دەستنووسـەیش لـە سـاڵی (١٣٤٩) نووسـراوە. ئەمەیش ئەوەمان بۆ دەستنیشان دەکات شیعرەکە لە ڕووی دەستنووسەوە لە نوسخەکانی لای کاک حەکیم و کاک ڕێبـوار کۆنترە و (١٣) ساڵیان بەینە. ئەوەی لەم نوسخەیەدا گرنگە نووسەرەوەی دەستنووس لە هەندێک جێگادا نوسـخەی تـری شیعری تاهیر بەگی لەبەردەست بووە و بەراوردی کردووە و ئاماژەی پێ کردووە.

ئەم شیعرە لەگەڵ دەقەکەی لای کاک ڕێبواردا هەندێک جیاوازیی هەیە. وەکو لە سەرەتاوە گوتمان چوار خاڵ دەبێتە هۆی تێکەڵبوونی هۆنراوەیە، ئەم هۆنراوەیە لەڕووی وشەسازی و سەبکەوە لەگەڵ دەقی شیعری تاهیر بەگدا تەواو نزیکـە و هیچ جیاوازییەکی تێدا نابینین. لەڕووی دەستاودەست کردنیشەوە ئەم شیعرە لە دوو نوسـخەدا یەکەمیان ناوی کاتبەکەی نەهێنراوە، دووهەمیان دەستنووسی دوکتۆر شۆیە و لە ساڵی (١٩٤١) نووسراوەتەوە، بە شیعری «کاتـب»یـان لـە قەڵـەم داوە، بەڵام لە کەشکۆڵستاندا کە لە ساڵی (١٩٢٨) نووسـراوە و نزیکە لە ساڵی مردنی شاعیریشـەوە شـیعرەکەی بـە هـی تاهیربەگی جاف داناوە. ئێمە لێرەدا بە لەبەرچاوگرتنی ئەم سێ خاڵەی خوارەوە، شیعرەکە بە هی تاهیر بـە گ لـە قەڵـەم دەدەین:

**یەکەم:** کۆنترین نوسـخە شیعرەکەی بە هی تاهیر بەگ داناوە. **دووەم:** لە سـەرەتای شیعرەکەوە ناوی شـاعیری لەسـەر نووسراوە و لە ڕیزبەندی شیعرەکانی تاهیر بەگدا هێناویەتی. **سێیەم:** لە ڕووی سـەبک و شـێوازەوە شـیعرەکە هـی تـاهیر بەگە.

## پیتی سین

### ١[1]

سـوور و سـپی و[2] ناسـکە، وەک چـوزەرە ڕێـواس
ئـاودار و تەڕ و تـازەیە کـوڵمەی وەکـو گـێلاس

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی بەردەستماندا نەهاتووە، تەنها لە چاپی (حس، کز)دا هاتووە، (حس) ئاماژەی بە ژمارە (٥٦)ی گۆڤاری سروە کردووە و سروەیش لە گۆڤاری نووسەری کوردستانی وەرگرتووە، نووسەری کوردستانیش لە بەیازێکی وەرگرتووە. (دیوان، حەسەن گۆران: ١١٢٧، ٤٣). وەکو ئەوەیش کە سروە ژمارە و وردەکارییەکانی دەستنیشان نەکردووە. (حس) بەدوادا چوونی بۆ ئەو بابەتە نەکردووە، ئەگەریش کردبێتی، ئەوا ئاماژەی پێ نەکردووە. کاک ئیسماعیل تەها لە شاری هەولێر ئەو ژمارەیەی گۆڤاری نووسەری کوردستانی بۆمان نارد، لە کۆتاییی شیعرە چاپکراوەکەوە وێنەی دەستنووسەکە هاتووە. لە پەراوێزدا بە هێمای (ئس) ئاماژەمان بۆ کردووە. ئامادەکاری ئەو بابەتەی شیعرەکەی تاهیر بەگی بڵاوکردووەتەوە، هەڵەی زۆری لە نووسینەوەی شیعرەکەدا کردووە. لە وتارەکەیدا دەڵێت: «لە گوندی "ئاکویان"ی نزیک شاری ڕواندز چەند دەستخەتێک دۆزرانەوە، دوای ساغکردنەوەیان دەرکەوت دوو شیعری تاهیربەگی شاعیری تێدایە، کە یەکێکیان کوردییە و لە دیوانە چاپکراوەکەشیدا نییە، دووەمیشیان فارسییە و جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ دەقەکەی ناو دیوانەکە...». (گۆڤاری نووسەری کوردستان: ١٩٨٩، ١٦، ١٧٥-١٧٦).

هەروەها لە دەستنووسێکی لای مامۆستا ئەحمەد حوسێن لە شاری سولەیمانی ئەم شیعرە بە ناوی (فائیز)ەوە بە ناتەواوی و جیاوازییەوە هاتووە و دەستنووسەکە لە (١٣٦٧/٥/١٣) بەرانبەر بە (١٩٤٨/٣/٢٤) زایینی نووسراوە، نزیک بە (٣٠) ساڵ دوای مردنی تاهیر بەگ دەکات؛ نووسراوە ئێمە دیوانی فائیزمان لەبەردەستدا نەبوو، بەڵام کە گۆڤارەکەمان دەست کەوت، بڕوای تەواومان بەوە هێنا کە شیعرەکە هی تاهیر بەگە نەک فائیز. هەرچەند ئێمە لە گۆڤاری بارانی ژمارە (٨)دا ئەوەمان خستۆتە ڕوو کە ئەم شیعرەیش یەکێکە لە شیعرە گومانلێکراوەکان، دوای دەستکەوتنی زانیاریی تازە، لێرەدا وەکو شیعرێکی تاهیر بەگ دادەنرێت. نابێت بەسەر ئەوەدا بچین کاتێک چاپەکەی (حس) و نوسخەکەی گۆڤاری نووسەری کوردستانمان بەراورد کرد، بینیمان کە (حس) جوانتر و ڕێکتر نووسیویەتیەوە و تەنیا یەک دوو جیاوازیی بچووکی لەگەڵ دەستنووسی ناوبراودا هەبوو، بەڵام ئامادەکاری شیعرەکەی تاهیر بەگ لە گۆڤاری نووسەری کوردستان هەڵەی زۆری لە شیعرەکەدا کردووە، ئێمە دوای بەراوردکردن و لێکۆڵینەوە، بەو شێوەی سەرەوە خستمانە ڕوو.

٢- ئس: سپییە.

ئەنـــدامی لەتیفـــی،[١] چ بڵـــێم عەینـــی بلـــووره
بۆی عەتری هەناسە و[٢] مەمکی کەللـە دەکـا[٣] کـاس
خـــاڵی حەبەشـــی، قـــرچە دەخـــاتە[٤] دڵـــی عاشـــق[٥]
شمشـــێری بـــرۆی سـینە دەکـا[٦] شـەق وەکـو ئەڵـماس
حەســـرەتزەدەیی عاشـــقی[٧] شـــەیدایە[٨] جەمـــاڵی[٩]
مەحفـــووزی بـــکەی ڕەببـــی (مـــن الجنـــة والنـــاس)[١٠]
لەو[١١] ســـوورەتە مـــەهپەیکەرە، لەو[١٢] ســـەروە[١٣] ڕەوانە
لەو زوڵـفە سـیەهـمارە[١٤] کە ئەو گەنـجە دەکـا[١٥] پـاس

---

١- نس: لەتیفت.

٢- نس: هەناسەی.

٣- نوسخەی ئەحمەد حەسەن: ئەکا.

٤- نس: ئەخاتە.

٥- حس: ئاشق؛ کز: عاشق، ئاشق هەڵەیە و دەبێت عاشق بێت.

٦- نس: ئەکا.

٧- حس: ئاشق؛ کز: عاشق، ئاشق هەڵەیە و دەبێت عاشق بێت.

٨- نس: شەیدای.

٩- نس: جەماڵت.

١٠- ئەم نیوەبەیتە لە نوسخەی (نس)دا لەگەڵ نیوەبەیتێکی تردا پێش و پاش کراوە.

١١- نس: ئەو.

١٢- نس: ئەو.

١٣- نس: سەروەی.

١٤- حس: سیامارە.

١٥- نس: ئەکا.

مــــوڵکی عـەجەم و ڕۆمە بەهـــای بووســـەیی لێـــوی
دەیــکەم بە فیــدای یەک نیگەهــی مـامش و بڵبـاس[١]
تـــاهیر ســـەری تەســـلیمە لەبەر خـــاکی بەری پێـــت
دایـنـــاوە ئیتـــر حەیــفە مەکە، بەســیە قســـە و بـــاس[٢]

١- ئەم بەیتە لە نوسخەی (نس)دا نەهاتووە.

٢- ئەم بەیتەیش لە (نس)دا نییە.

## پیتی میم

١[١]

رەفیقـــان تـــا گرفتـــاری[٢] نیـــاز و نـــازی[٣] دڵـــبەر بـــم
لە تەختـەی نەردی غـەمبـاری، دەبـێ وا بەنـدی شەشـدەر بـم
بە قەولـــی مـــوددەعی جانـــا! ئەگەر میهـــرت لە دڵ دەرکەم
تەنـــافێکم لە گەردن خە،[٤] هیلاکـــی تێغـــی خەنـــجەر بـــم
قەبـــوولم کە غولامـــت بـــم، غـــولامی پاســـەبانت بـــم
ئەتۆ وەک شاهی مەردان بە، منیش[٥] بـا میسـلی قەنبەر[٦] بـم
لە ماچێکـــت نەگـــرتم[٧] شـــاد لە لێـــوی ئـــاڵی گوڵڕەنگـــت
عـەزیزم! تـا بەکەی مـن بێنەسـیبی شـەهد و[٨] شـەککەر بـم؟
ئەگەر جارووکەشـیی دەرگـانەکەت ڕۆژێ[٩] بە قیسـمەت بـێ
خـوا نەیکـا لە دونیـادا خەیـاڵی[١٠] تەختـی قەیسـەر بـم

---

١- ئەم غەزەلە دووجار لە نوسخەی (کف)دا هاتووە، وێڕای ئەوەش جیاوازییـان هەیە. ئـێمە هەردوو دەقەکەمـان بەراورد کردووە و بە کف١ و کف٢ ئاماژەمان بۆ کردوون.

٢- کف٢: گورفتاری.

٣- کف٢: نازەنینیی.

٤- کف٢: گەردن خەن.

٥- کف١: ئەمن.

٦- کف٢: قەمەر.

٧- کف١: لە بێ حوکمت نەگردم.

٨- کف١: شەهیدی.

٩- کف١: ڕۆژانە.

١٠- کف١: سەرفرووزی.

ئەگەر دەستم کەوێ جانا دەمێ بۆسەی کەناری تۆ

حەرام بێ گەر بە ئومێدی بەهەشت و حەوزی کەوسەر بم

وتم: تەشبیهی ڕوخسارت بە مانگ و خۆر دەکا[1] تاهیر

وتی: دەشکێنێ بازارم،[2] ئەگەر وەک شەمسی خاوەر بم

١- کف٢: ئەکا.

٢- کف٢: بازارت.

۲[١]

(یـــا رســـول اللّه دخیلـــک) عاشـــق و سەوداســـەرم[٢]
ڕووســـیاه و شەرمەســـارم،[٣] ڕووم نیـــیە نـــاوت بەرم
یەک دەمـــێ غافـــڵ لە عیســـیان و لە بەدکـــاریم[٤] نیـــیە،
ئەی ئومێـــدی بێئومێـــدان![٥] نـــەفسی میحنەتـــپەروەرم.
چی دەبێ یەک لوقمە ئیحسان کەی لە خـوانی[٦] لـوتفی خـۆت
تـــۆ شەهەنشـــاهی[٧] جیهـــان[٨] و مـــن گەدایـــی کیشـــوەرم
ڕوو لە من کە یەک دەمـێ[٩] تـۆبی و خـوا ئەی نـووری حەق![١٠]
بەڵکـو[١١] فـاریغ بـێ لە زەحـمەت،[١٢] ئیسـمەکەی سـەردەفتەرم

---

١- ئەم شیعرە لە نوسخەکانی (کف، کۆ و مح)دا هاتووە، لە چاپی (حس)دا (٤) بەیتی کۆتـاییی هـاتووە و لە (کز)یشـدا بەبێ ناوهێنانی سەرچاوەکەی و بە جیاوازییەکی زۆرەوە هۆنراوەکەی بڵاو کراوەتەوە.

٢- مح: سەوداگەرم.

٣- کۆ، مح: پڕ گوناهم.

٤- کۆ: بەدکاریی.

٥- مح: ڕووسیاهان.

٦- کف: خابی.

٧- کف: شەهەنشای.

٨- مح: جیهانی.

٩- مح: دەفعەیە، کۆ: یا حەبیب.

١٠- کف: نووری عەین.

١١- مح: بەڵکە.

١٢- کۆ: لەززەت؛ مح: مەینەت.

چـــاوەڕێی یەک زەڕڕە خـــاکی دەرگەهـــی تـــۆم چـــاوەکەم[١]

گەر بگـــاتە ئاســـمانی هەفتەمینـــیش[٢] ئەفســـەرم

چـــونکە ئیســـمی بەنـــدەگیی تـــۆ شـــامیلی حـــاڵی مـــنە

موســـتەحەققی ڕەحمەتـــم، گەر مـــوئمینم، گەر کـــافرم

(مَلجَـــأ) و پشـــت و پەنـــایێ،[٣] غەیـــری لـــوتفی تـــۆ نیـــیە

گەر ببـــەخشی وەر نەبـــەخشی، جـــان نیســـار و چـــاکرم

تـــالیبی دیبـــای شـــەفاعەت، کەس نیـــیە وەک مـــن بە دڵ

بـــۆ مەتـــاعی ڕەحمەتـــت قوربـــان! ئەمـــن ســـەوداگەرم[٤]

نـــابێ تەنهـــا مـــن[٥] لە لوتفـــت بـــێ نەســـیب و بەهـــرە بـــم

چـــونکە فەرمـــووتە: شـــەفیع و شەهســـواری مەحشـــەرم

نەعتـــی شـــاهی ئەنبیـــا تـــاهیر کە هـــاتە ســـەر زبـــان

جیلوەبـــــەخشی زەوقە ئیمـــــڕۆ نەزمەکەی پڕشـــــەککەرم

---

١- کۆ، مح: ڕۆحەکەم.

٢- کۆ، مح، کف: هەفتەمینش.

٣- کۆ: پەناهم؛ مو: پەنای پەناهم.

٤- کف: بۆ مەتاعی ڕەحمەتی تۆ، ئیمڕۆ ئەمن سەوداگەرم.

٥- کف، مح: من تەنها.

## ۳[1]

هەرچەندە دەمێکە لە غەما غەرقەیی خوونم
هەر لەحەزە لەدەس جەوری فەلەک زار و زەبوونم
بەستراوە بە زنجیری ئەلەم گەردنی شەوقم
مەشهوورە لەناو ئەهلی جیهان، شۆری جنوونم
ئەلفی قەدەکەم ڕاستە، وەکو تیری خەدەنگ بوو
وا خەم بووە ئێستا کە ئەڵێی حەڵقەیی نوونم
مەعشووقە کەوا موونیسی ڕۆژ، هەمدەمی شەو بوو
وەک ئاهووی ڕەمکەردە، لەدەس بەختی نگوونم
دڵ مولکی عەجەم، عەسکەری غەم، لەشکری سالار
وێرانی دەکا ئاخری، بێسوودە فسوونم
مەرهەم، کە شەفابەخشی برینە بە حەقیقەت
وەک داغی لەسەر داغە، لەبۆ داغی دەروونم
چونکە هەموو شێواوە جیهان تەرز و ڕەوشتی
یەکسانە لەلام شادی و غەم، بوون و نەبوونم
سەد شوکری خودا، مەرکەزی سەد میحنەت و دەردم
وا تێ مەگە لەم دائیرەیی چەرخە برروونم[2]

---

١- ئەم شیعرە لە دەستنووسی (کب) وەرگیراوە. لە چاپەکانیشدا بەبێ ناوهێنانی سەرچاوەکەی و بە جیاوازییەکی زۆرەوە بڵاویان کردووەتەوە.

٢- مع، حم، حس: بیروون.

تـــاهیر وەکـــو مەجنـــوون لە خەیـــاڵی ڕوخـــی لەیـــلا

دێـــــوانە لە ســــــەحرا و سەراســــــیمە لە تـــــوونم

## پیتی نوون

١[1]

نمــــوونەی ڕوویــــی تــــۆیە مـــاهی تابـــان
نەزیـــری مــــوویی تـــۆیە ڕەنگـــی قەتـــران
لە شـــەککەرباری لێـــوت بێنەســـیب بـــووم[2]
بەڵـــی، هەر تەنگــــڕۆزین ئەهلـــی عیرفـــان
بە مــــاچێکی دەبەخشـــــم گەر کەرەم کـــا
جەمیعـــی خەرج و دەخڵـــی مـــوڵکی بابـــان
بـــرۆ و ڕوخســـار و زوڵـــف و لێـــوی ئاڵـــت
شـــەو[3] و ڕۆژ و هـــیلال و عیقـــد و مەرجـــان
بیحەمـــدیللاهـ تـــۆی ئیمـــڕۆ بە خـــووبی
لە جێـــی فەرزەنـــدی خاســـی پیـــری کەنعـــان
نە مـــن مـــاچی لەبـــی تـــۆم بـــوو بە قسمەت
نە ئەســـکەندەر گەیشـــتە ئـــاوی[4] حەیـــوان

---

١- ئەم شیعرە لە نوسخەکانی (کف، مح و کب)دا و لە چاپەکانیشدا هاتووە.

٢- مح: مام.

٣- مح: شەب.

٤- کف، مح: ئابی.

بە زاهیـــــر قەت[1] ئەبەم نـــــاوی[2] ویســـــاڵت

لە خـــۆفی حاســـید و بیمـــــی ڕەقیبـــان؟

حیکـــایەت بـــوو لە تـــووڵی زوڵفـــت ئیمشـــەو

هەتـــا جەمعـــــی ڕەفیقـــان بـــوون پەرێشـــان

وەرە تەســـــلیم کە ڕۆحـــــت بـــا خەڵاس بـــی

ئەتـــۆیش تـــاهیر وەکـــو جەمعـــی ڕەفیقـــان

---

١- مح: قەد.

٢- کف، مح: دەبەم نیسمی.

## پیتی هێ

### ١[١]

فەسڵی خەزانی هیجرە، ڕەسمی زەمانی[٢] دوونە
دەردی فیراقی یاران، تەقدیری کاف و نوونە
دونیایە ڕەسمی[٣] وایە، بەزمی هەموو[٤] بەڵایە
عەیشی هەموو جەفایە، بادە بە ڕەنگی خوونە
گوڵە ڕەفیقی خارە، شەرابە پڕخومارە
گەنجە ئەنیسی مارە، بۆیە[٥] نکوو نەبوونە[٦]
بێزارە تەن لە هیجران، چاویش پڕە لە گریان
چی بکەم عیلاجی قوربان؟ دل عاجز و زەبوونە

---

١- ئەم شیعرە تەنها لە نوسخەکانی (کف و کب)دا هەیە، لە چاپەکانیشدا هاتووە.

گومانی زۆرمان بۆ ئەوە دەچێت ئەم غەزەلە هی ناری بێت. لە بەیتی پێنجەمدا بە ڕوونی ناوی ناری هاتووە و بەیتی کۆتاییش کە ناوی تاهیری تێدا براوە تەنها لە نوسخەی (کف)دا هەیە. ئەو بەیتەی کە ناوی تاهیر بەگی تێدا هاتووە لەچاو بەیتەکانی تری غەزەلەکەدا یەکجار لاوازە و زۆر بەدووری دەزانین بەیتی کۆتایی بەشێک بووبێت لە غەزەلەکە. زۆر ڕێی تێ دەچێت ئەم غەزەلە هی ناری بێت، بەڵام لەبەرئەوەی هیچ نوسخەیەکی دیوانی نارییمان لەبەردەستدا نییە و لە دیوانە چاپکراوەکەشیدا نەهاتووە لێرەدا دایدەنێین و تا یەکلابوونەوەی ناچارین بە هی تاهیر بەگ لەقەڵەمی بدەین.

٢- کف: جەهانی.

٣- کف: دونیا بە ڕەسمە.

٤- کف: وەکو.

٥- کب: بوو بە

٦- کف: بە بوونە، حس: بەو بۆنەوە بەبوونە.

مەیلـــی[١] فیراقـــی نـــاری، دونیـــا وەهـــایە[٢] کـــاری
ئەم چەرخە پڕلەشـــــۆڕە، ئەرکـــــانی واژگـــــوونە[٣]
شـــیرینە وەســـڵی یـــاران، چـــونکە دەگـــاتە هیجـــران
نـــازانی ڕۆحـــم ئـــامەمان![٤] چەنـــد تـــاڵ و تـــرش[٥] و تـــوونە
لـــەژێری[٦] غەم مەوێســـتە، فەرمـــوو دەســـت بهێـــنە
خزمـــانی شـــادمانە، تـــاهیر کەچـــی زەبـــوونە[٧]

١-کف: مەیلت.

٢-کب: وەها بە.

٣-کب: ئەم چەرخە واژگوونە، ئەرکانی پڕ لە شۆڕە.

٤- حس: ئەمما.

٥-کب: ترش و تاڵ.

٦- حس: لەژێر خەما. لە (کف)دا نووسراوە (دەر ژێر)، ئەم جۆرە دەربڕینە لە ناو شـیعری کوردیـدا نامۆیـە و پـێمان وایـە (لە) دروستترە.

٧-ئەم بەیتە لە (کب)دا نەهاتووە.

٢[١]

ڕۆژی تەرەب و وەختـــی[٢] گـــوڵ و فەســـڵی[٣] بەهـــارە
یـــاران گـــوڵەکەم، کـــوا؟[٤] کە دەمـــی بـــۆس و کەنـــارە
گـــوڵزاری ئیـــرەم ڕەنگـــە بشـــوبهێ لـــە تەرەبـــدا[٥]
بـــەم نێـــو چەمەن[٦] و ڕوویـــی گـــوڵ و پـــایی چنـــارە
بنـــوارە لەبـــۆ حەڵقەیـــی زوڵفـــت لە ســـەری کـــوڵم
دەدرەخشـــێ درەخشـــانیی، نیـــوەی[٧] شـــەوی تـــارە
بەو زوڵـــف و مـــوژەت مەمکـــوژە هەردەم بە جەفـــایێ
جـــارێ لە تەنـــافم مەدە، ســـەد جـــار لە قەنـــارە
تیـــری مـــــوژەکەت قـــــاتڵە هەردەم بە بەڵایـــێ
هەردەم[٨] لە دڵـــی خەســـتەدڵان، پەیکـــی قومـــارە[٩]

---

١- ئەم شیعرە تەنها لە نوسخەی (کف و کب) و لە چاپەکانیشدا هاتووە.

٢- کب: فەسڵی.

٣- کب: وەقتی.

٤- کف: کوە؛ کب: کۆ، کوا دروستترە.

٥- کف: سوورەتی غیلمانی قەدی تۆیە.

٦- کف: گوڵەی چەمەن.

٧- کف: درەفشی درەخشانی نیوەشەوی تارە؛ کب: درخشانییە نیوەشـەو، لـە چـاپی (مـع، حـم)دا نووسـراوە (دەدرەخشـێ درەخشانە نیوەشەوی)، ئەوەی سەرەوە دروستترە.

٨- کب: دایم.

٩- کب و کف: خومارە.

ســـــووتاو و برینـــــدارم و ســـــەودایی و مەســـــتم
بەو زوڵـــــفە[١] و بەو پەرچەمە، بەو چـــــاوە خومـــــارە
ئەو خـــاڵە لەســـەر لێـــوتە جانـــا، چیـــیە؟ فەرمـــوو!
جێـــــی مـــــاچی لەبـــــی تـــــاهیرە، نیشـــــانەیی پـــــارە

## ٣[١]

دڵ نەخۆشی دەردی هیجرە،[٢] جانی جانانم وەرە
لەتلەتە جەرگ و هەناوم، ماهی تابانم وەرە
عیللەتی دەرد و شەفاکەم وا بە لێوی شەککەرت
مایەیی ژین و حەیاتم، دەرد و دەرمانم وەرە
گەر دەزانی چەند پەشێوە حاڵەکەم بۆ دیتنت
سەد ئەوەندەی زوڵفەکانت دڵپەرێشانم وەرە
سەد حەکیم هات و عیلاجی ئەم برینانەی نەکرد
تۆ عیلاجی زەخمەکەم کە، زوو بە لوقمانم وەرە![٣]
ڕۆژی جەژنە چاوەکانم! مەوسیمی ئازادییە[٤]
بۆ بەڵاگەردانی باڵات، قوچی قوربانم وەرە
دڵبەرەی قەد عەرعەرەی بێڕەحمەکەی بەدبەختەکەم[٥]
دڵڕفێنەی شۆخەکەی[٦] بێ عەهد و پەیمانم وەرە

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، مح، دک و کب)دا هاتووە. لە هەموو چاپەکان و لە نامەی فەرهەنگیی کۆهستانیشدا هاتووە. ئەم غەزەلە لە نوسخەی (دک)دا هەندێکی بەهۆی ڕزینی نوسخەکەوە ناخوێنرێتەوە.

٢- لە (کف)دا نووسراوە (هیجران) و هەڵەیە و دەبێت (هیجرە) بێت.

٣- ئەم بەیتە و بەیتی سەروو خۆی تەنها لە (مح)دا هاتوون.

٤- ئەم نیوەبەیتە لە (کب و مح)دا بەم شێوەیە هاتووە: (سەد شوکر دووبارە عیدە وەقتی عەیش و شادییە)، (کب) وشەی عیدی نەهێناوە. لە (مح)دا ئەم بەیتە دووجار هاتووە، تەنها نیوەبەیتی یەکەمیان جیاوازە، لە دووەمیاندا بەو شێوەیەی سەرەوەیە.

٥- کب: کە.

٦- مح: شۆخ و شەنگەی.

نـــازەنینەی ســـوخمەئاڵەی دیدەمەســـتەی کەچکـــولاھ
گوڵعـــوزارەی شـــۆخ و شـــەنگەی شـــاهی خووبـــانم وەرە
خـــانەوێرانم لە دووریـــــت، ڕەزەنـــــی ئـــیمان و دڵ![1]
زینەتـــی بەزم و ســـروورم[2] شـــەمعی دیـــوانم[3] وەرە
چـونکە سـایەی چەتـری زوڵفـت دوور لـە فەرقـی فەرقـمە
ســـینە پـــڕ خـــوێن و زووخـــاوم، دڵپەرێشـــانم وەرە
دوور لە بـــاڵای نەونەمامـــت، زامـــی جەرگـــم تـــازەیە
وەک عـەرەب ســـەد جـار دەخـــیلم،[4] زوویە لـــوقمانم وەرە[5]
لوتـف و قەهـری تـۆ لە لای مـن هەر وەکـو یەک شـادییە
کـــەعبە کـــەچ نـــابێ لەبـــەر تەعـنەی ڕەقیبـانم وەرە[6]

---

١- مح: نەونیهاڵەی نازەنین.

٢- لە سەرجەم نوسخەکاندا نووسراوە (سەریرم). ڕوون و ئاشکرایە کە هەڵە نووسراوەتەوە و سرووورم بووە.

٣- مح، کب: ئەیوانم.

٤- کب: دەخیلەک.

٥- لە (مح)دا ئەم بەیتە نووسراوە و دواتر خەت بەسەریدا هێنراوە و نووسراوە (ایـن سـهو اسـت)، دواتـر لە کەنـارییەوە نووسراوە (این شعر ظاهراً غلط اسـت، چونکـە تکـرار اسـت). لە کۆتـاییی نیـوەدێری یەکەم لەبـری (تـازەیە) نووسـراوە (هاتەوە) و لە کۆتـاییی نیـوەی دووەمـیش تەنهـا (دەسـت بە دامـانم وەرە) جیـاوازە. لە هەنـدێک جێگـای ئەم شـیعرەدا نووسـەرەوە نوسخەی تری لە بەردەستدا بووە و نووسـیویەتی (نسـخە)، لەبـری ئەم بەیـتەیش بەیتێکـی تـر هـاتووە و بەم شێوەیە:

ئەی مەسیحا دڵ لە دەستت چوو وا بە ناری فیرقەتت      وەک عەرەب سەد جار دەخیلەک، دەستـەدامانم وەرە

٦- ئەم بەیتە تەنها لە (مح)دا هاتووە.

کەس نییە سابت قەدەم، وەک مـن لە داوی عەشـقی تـۆ[١]
بـــۆ ســـوپاهی غەمزەکانـــت مەردی مەیـــدانم، وەرە[٢]
گەر دەپرسـی[٣] حـاڵەتی مـن بـۆ فیراقـت پێـت بڵـیم؟[٤]
هەر وەکـــو تـــاهیر هەمیشـــە دیـــدەگریانم وەرە

---

١- کف، مح: عەشقدا.

٢- لە (مح)دا ئەم بەیتە بەم شێوەیە هاتووە:

هەر کەسێ هاتووە بە تیری غەمزەکەت سەدپارە بوو    کەس نییە وەک من حەریفت، مەردی مەیدانم وەرە

٣- کب: نەپرسی.

٤- مح: ڕۆژ و شەو دایم دەناڵم من لە دووریی چاوەکەت.

٤[١]

دڵ لە هیجــــــرت وا[٢] لە غەمـــــــدا ماهڕوخســــــارم وەرە
زەخــــمە جەرگــــم بــــۆ فیراقــــت زوو بە لـــــوقمانم![٣] وەرە
کـــــافرا! دەردی فیراقـــــــت وا لە جەرگـــــم کــــارییە
ســــا بکـــــە ڕەحمــــێ بە حـــالّم، مـــاهی تابـــانم وەرە
ســەد کەڕەت ئیمــڕۆ لە دووریــت خــوێن لە چاوم[٤] جارییە
غەرقــی دەریــای ئەشــکی خــوێنم،[٥] شەمســی تابـانم[٦] وەرە
گەه دەگریـــــەم، گەه دەســـــووتێم، کاروبــــارم زاریــــیە
زێـــــوەری تــــاجی غەریبـــیم، شـــــاهی خووبــــانم وەرە
ســــینەناڵان هەر وەکــــو بولبــــول لە دووریـــی گوڵشــــەنت
ســــا بە لـــــوتفێ بمـــــدوێنە،[٧] جــــانی جانــــانم وەرە
بەس جەفـــا بنـــوێنە قوربـــان! زوڵمـــی نـــاحەق چـــا نییــە
کـــافریش ڕەحمـــــی بە ســــەیدە، دیـــن و ئـــیمانم وەرە[٨]

---

١- ئەم غەزەلە تەنیا لە نوسخەی (کف و کب)دا هاتووە، لە چاپەکانیشدا هاتووە و جیاوازییەکی زۆریان هەیە.

٢- لە نوسخەکەدا نووسراوە (پڕ) ئێمە بە هەڵەمان زانی و (وا)مان بە دروستتر زانی و دامان نا.

٣- کب: هاوارم.

٤- کب: جەرگم.

٥- کف: عەینم.

٦- کب: خووبانم.

٧- کف: بملەوێنە.

٨- کف: کافریش ڕەحمێ بە سەیدی خۆی هەیە، دین و ئیمانم وەرە.

ســـــوورەتی بـــالآت بە دایـــم نەقشـــی قەلبـــی زارمە
هەر وەکـــو مەجنـــوون لە عەشـــقت، دەیـــدەگریانم وەرە
دیدەمەســـتی شـــۆخ و شـــەنگە، نـــازەنینەی شـــارەزوور
دڵرفێنـــی جەمعـــی عـــالەم، کەبکـــی کۆهســـارم وەرە
دڵ لە دووریـت[١] پـڕ لە خـوێنە، شـەمعی دیـوانی ئـەمن[٢]
هەر وەکـــو تـــاهیر هەمیشـــە[٣] ســـینەبریانم[٤] وەرە

١- کب: هیجرت.

٢- کب: میری میرانم وەرە.

٣- کب: بەدایم.

٤- کف: ناڵانم.

## ٥[١]

ئـەم کـەوا تـاقی[٢] سـەمەن ساقە، لـەبی خـۆش نمەکـە
پەریـیـە، ئادەمییـە، یـاخۆ لـە جینـسی مەلەکـە؟
جیلوەیی حوسنی تەماشا کـە، مەکـە مـەدحی لیبـاس
چ زەروورێکـە کـەوا ئەتڵەسـە یـاخۆ قەدەکـە
فـەرقی ڕوخسـاری سـەفاکاری لەگـەڵ بـەدری مـونیر
بـە مەسـەل فەرقـە لـە مابـەینی سـەما و سـەمەکە
مەجلیسی عیشـرەتە دەرخـا هـەموو ئـەخلاقی بەشـەر
مەی لـە بـۆ ئـەهلی هونـەر زاهیـرە، عـەینی مەحەکـە
یـەک دەباتـە فەلـەک و یـەک دەگەیێنێتـە زەوی
گەردشـی دەوری زەمـان هـەر وەکـو چـەرخ و فەلەکـە
شـێخ دەڵـێ: سـەیری بکـەن داوی منـە سـەید دەگـرێ
جببـە و ڕیـش و ڕیـایی زوور و (تحـت الحنکـە)
پێـی بڵـێن: گـاهێ وەرە دائیرەیـی سـیدق و سـەفا
نەغمەیـە، دائیرەیـە، دەفزەنـە، تـارە، دمەکـە

---

١- تەنها لە نوسخەی (کم)دا هاتووە.

٢- کف: تاقە.

٦[١]

تـــا بەکەی قوربـــان بنـــاڵم مـــن[٢] بە ئـــێش و دەردەوە
دەس بە ئەژنـۆ،[٣] قـورِ بە سـەر، دایـم بە ئـاهی سـەردەوە[٤]
ڕۆژی ئەووەڵ بـوو کە زانـیم مـن دەبـێ[٥] دێـوانە بـم
عاشـقی تـۆ، نەوعـی مەجنـوون، وا[٦] بە کێـو و هەردەوە
مەرحەمەت کە زوو بـڕۆ قاسـید بڵـێ دەردی دڵـم
نـازی پاپۆشـت دەکێشـم[٧] مـن بە تـۆز و گەردەوە

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، مح، دک، کم و کب)دا هاتووە. لە نوسخەی (کم)دا هەندێک بەیتی جێگۆڕکێی پێ کراوە، بەڵام لە بەیتی (تا بەکەی قوربان...)ەوە دەست پێ دەکات، نوسخەی (مح و دک) لەگەڵ شیعری (دڵ لە حەسرەت غەمزەکەی دوو نێرگسی پڕ خەوتەوە)دا هاتووە، لە چاپەکانیشدا (مع و حم) بە یەک شیعریان داناوە، هەروەها لە نامەی فەرهەنگیی کۆهستانیشدا لەگەڵ پێنج خشتەکییەکەی ئەدەبدا هاتووە کە لەسەر ئەم غەزەلە هۆنیویەتیەوە. ئێمە بڕوامان وایە ئەوەی (کم) دروستترە، چونکە نووسەرەوەی زۆربەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە بووە، ئەو بەیتانەیش کە لە هەندێک نوسخەدا پێش (تا بەکەی قوربان...) هاتوون، هۆنراوەی (ئەدەب)ی شاعیرن و (ئەدیب)ی شاعیریش کاتێک هۆنراوەکەی تاهیر بەگی تەخمیس کردووە، ئەو بەشەی سەرەتای تەخمیس نەکردووە. ئێمەیش بەشی سەرەتای هۆنراوەکەمان لێرەدا لابردووە.

٢- کم: وا بە.

٣- کم: دەستەئەژنۆ.

٤- لە (مح)دا ئەم بەیتە نەهاتووە. کب: ڕەنگی زەردەوە.

٥- کف: ئەبێ.

٦- کف: ها.

٧- کف: ئەکێشم.

هەر وەکــو قەوس و قەزەح[١] بــا دەس لە گەردن دانشــین
تـۆ بە سـوخمەی ئـاڵ و سـەوز[٢] و مـن بە ڕەنگـی زەردەوە[٣]

مــن کەوا پشــتانی بــاڵا و بۆســەچینی کــوڵمتم[٤]
چــی دەکەم[٥] ئــاخر لە ســەیری بــاغ و بــۆنی وەردەوە[٦]

یەک نەفەس چــاکی نەهێنــا کەعبەتەینــی بەخــتەکەم
شــەش دەرم گیــراوە، دامــاوم[٧] بە دەســتی نەردەوە

ئیلتیماســی تــاهیری بێچــارە قەت[٨] ســوودی نیــیە
تــۆ کە دایــم شەڕفرۆشــی بەو[٩] دڵەی وەک بەردەوە

١- دک: قەز.
٢- دک: سەوز و سوور.
٣- لە (کم)دا ئەم بەیتە دەبێتە بەیتی سێهەم؛ لە (کب)یشدا پاش و پێشی پێکراوە.
٤- کف، مح، دک: من کە پشتانی باڵا و بۆسەچینی کوڵمتم؛ کم: چونکە من پشتانی بەڵا و بۆسەچینی کوڵمەتم.
٥- کب: بکەم.
٦- مح: بەی نەی وەردەوە؛ کف، مح، دک: بەی نەی دەردەوە.
٧- کم: مەشغووڵم.
٨- کف، دک، مح، کم: قەد.
٩- کم: بەم.

۷[۱]

مەمکـوژە جانـا بە هیجـران، ئەی جەفاکـارم وەرە!
تـاب و تـاقەت چـوو بە جـارێ،[۲] یـاری غەمخـوارم وەرە
بـۆچ ئەوەنـدە ئـارەزووت بـۆ قەتڵـی ئەم بێچـارەیـە؟
کوشـتنی عاشـق درێـغ مەیفەرمـوو،[۳] سـەردارم وەرە
بولبـولی زارم دەنـاڵم، قەقنەسـم ئـاگر بە جـان
گـا دەگریـەم، گـا دەسـووتێم، یـاری غەددارم[٤] وەرە
خـاڵی کولّمـت هەر وەکـو فلفـل دەسـووتێنێ دڵـم
کەس نیـیە دەردم دەوا کـا، تـۆ بە هـاوارم وەرە
دڵ لە دووریـت ئـاگری گـرت، بەسـیە یـاری نـازەنین!
تـۆی عیلاجـی دەردی تـاهیر، زوو بە فریـادم وەرە

---

۱- ئەم غەزەلە تەنیا لە نوسخەی (کب)دا هەیە، لە چاپەکانیشدا هاتووە.

۲- کب: لە دەستم.

۳- کب: درێغە، مەیکە.

٤- کب: غەمخوارم.

## ٨[1]

تیری غەمزەی چاوەکانت وا لە جەرگم کارییە
ئێستە ئەشکم وا بە خوڕ دێ، ڕەنگەکەی گوڵنارییە
نەفسی سەرکەش! چەند ڕۆژێ گەر جیهان ڕامت[2] بووە
دڵ ئەگەر خۆش کەی بە خۆت، بێعارییە، بەم عارییە
گوڵ ئەگەر بێ،[3] خۆی موقابیل کا بە تۆ، لێی ناگرم
هەرزەگۆیە و بێوەفایە،[4] دڵبەری بازاڕییە
ناشکێ قوربان دڵم، هەرگیز لەبەر جەوری ڕەقیب
عادەتی ئەو دایما[5] هەر فیتنە و بەدکارییە
لێم گەڕێن[6] تەنهانشینی کونجی غەم بم ئەی ڕەقیب!
دەردەکەی من دەردی عەشقە و زۆر گران و سارییە[7]
زاهیدی خودبین کە حەیوانە لە وادیی عەشقدا
ڕیشەکەی پان و درێژی[8] ڕەشمە و هەوسارییە

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، دک، مح، کب) و چاپەکانیشدا هاتووە، نوسخەی (دک) بەشێکی ڕزیوە و فەوتاوە.

٢- کب: جیهانت ڕام.

٣- کف، دک، مح: هات.

٤- دک، مح: حەفازە؛ مح: بێجەفایە.

٥- کف، دک، مح: دایمە.

٦- کف، دک: لێم گەڕێ.

٧- مح: کارییە.

٨- لە (مح)دا نووسراوە (درێژە)، نووسەرەوەی دەستنووس نوسخەی تری لە بەردەست بووە و نووسیویەتی (بدل: درێژی).

سەبر و هۆش و ڕۆحی بردم، هەر بە جارێ ئێستەکە[١]
هیچ نەما کاری بە من، بێکارە وا پەیکارییە[٢]
جارێ ناپرسی لە حاڵی من مەگەر نازانی تۆ
زار و بێزار و نەزارم، کاری من هەر زارییە
تازە زانیومە لەسەر دینی مەسیحایە نیگار[٣]
پەرچەمی عەینی سەلیبە، زوڵفەکەی ڕەشمارییە[٤]
تاقەتی شیعری نەماوە هیچ لەبەر ڕەنج و فیراق
ئەم کەلامە گەر[٥] دەڵێ[٦] تاهیر لەبەر بێعارییە

---

١- کف، دک: ئێستەکە.

٢- لە (مح)دا نووسراوە (بێکارییە بەم کارییە)، لە نوسخەی بەدەلی نووسەرەوەی دەستنووسدا بەو شێوەیە هاتووە.

٣- کف: نیگارییە؛ دک، مح: نیگار، نیگارییە هەڵەیە و دەبێت (نیگار) بێت.

٤- کف، دک: ڕەشمارییە.

٥- لە (مح)دا نووسراوە (گەر) و لە بەدەلیشدا بە (مەگەر) هاتووە.

٦- کب: بڵێ.

٩[١]

دونیـــا کە هەمـــوو لەحـــزەیە[٢] مەعشـــووقی کەســـێکە
بنـــــوارە کە چەن[٣] قەحـــــبە، چ کـــۆنە تەرەســـــێکە!
تێفکــــرە وەکــــو کەلبـــــی نیهـــــانگیرە[٤] زەمــــانە
ئەبنــایی جیهــان یەک بە یەکــی، ســە گ مەگەســێکە
عـــالەم هەمـــوو وەک تەیـــرە،[٥] تەمەع دانە،[٦] ئەمەل داو
ســـەییادی ئەجەل، ســـاحەتی دونیـــا قەفەســـێکە
لەم حــوجرەیی شــەش گۆشــە کە رێ مەعــبەری عــامە
یـــارەب چیـــیە هەر کەس بە هەوا و هەوەســـێکە؟
ســـەد قـــافڵە ڕابـــورد و ئەتـــۆ غـــافڵی ئەی دڵ!
گـــوێ بگـــرە لە هەرلایـــێ کە نـــاڵەی جەرەســـێکە

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، دک، مح و کب) و چاپکراوەکانیشدا هاتووە. نوسخەی (دک) لەبەر ئەوەی مۆرانە خواردوویەتی، بەشێکی لەناو چووە.

٢- لە هەموو نوسخە و چاپەکاندا نووسراوە (هەموو لەحزە بە...)، بەڵام ئێمە بڕوامان وایە دەبێت (هەموو لەحزەیە) بێت و وایشمان لێ کرد.

٣- مح: چەند.

٤- کف، مح: نیهانگیری.

٥- کب: تەیر.

٦- مح: دانە و.

شـــادی و غـەم و ئەنـــدووە چیـــیە، [1] ڕەنـــج و ئەلـــیمە؟
ئیقبـــــاڵ و زەواڵـــــی [2] بەخـــــودا [3] هەر نەفەســـــێکە
تـــــاهیر! مەبە ئـــــازوردە، زەمـــــان عـــــادەتی جەورە
دونیـــــا کە هەمـــــوو ڕۆژێ ژنـــــی بولهەوەســـــێکە

١- لە (کف)دا بە (ئەندوو چییە هەر) هاتووە و لە (مح)یشدا بە (ئەندووە هەر چییە) نووسراوە؛ کب: دەرد چییە. ئەوەی لە نوسخەی (مح)دا هاتووە، (هەر)ەکەی زیادە و وەزنەکەی تێک دەدات.

٢- کف: ئیقباڵ زەواڵە؛ مح، دک: ئیقباڵ زەواڵ.

٣- کف، مح: بەخوا.

١٠[١]

فیـدای ڕوخساری[٢] ئاڵـت بـم ئەڵێـی[٣] خورشـیدی تابـانە
بەلاگەردانـی بـالآت بـم، ئەڵێـی[٤] شمشـادی بوسـتانە
لە سـایەی تێغـی ئەبـرۆی تـۆ، لە ڕۆژی حەشـردا جانـا
بیحەمـدیللا حیسـابی مـن لەگەڵ جەمعـی[٥] شـەهیدانە[٦]
دەزانـی بـۆچی مەسـروورم؟ ئیشـارەی کرد مـێ دڵـبەر
وتـی: حـازر بە بـۆ کوشـتن سـبەینێ جەژنـی قوربـانە
لە ئـاهم گەر بسـووتێ ئاسـمان بـاوەڕ بـکەن ئەمشـەو
ئیتـر یـاران![٧] چ بـاکم مـن لە سـەردیی فەسـڵی[٨] زسـتانە[٩]
کە[١٠] زوڵفی عـاریزی پۆشـی،[١١] وتـم: یـارەب چ سـیرێکە[١٢]
لە لایـێ زوڵمەتـی کـوفرە، لە لایـێ نـووری ئـیمانە

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، دک، مح، کب) و نامەی فەرهەنگیی کۆهستان و چاپکراوەکانیشدا هاتووە. بەشێکی نوسخەی (دک) لەبەر ئەوەی مۆرانە خواردوویەتی فەوتاوە. لە (کب)یشدا دووجار هاتووە.

٢- لە (مح)دا نووسراوە (ڕوخسار) و دواتر نووسراوە لە بەدەلدا (ڕوخسار).

٣- کب: دەڵێی.

٤- مح: وەکو؛ کب: دەڵێی.

٥- کب: جوملەی.

٦- کب: ئەم بەیتە و بەیتی دواتری پاش و پێش کردووە.

٧- کف: یارەب.

٨- مح: وەقتی.

٩- لە (مح)دا ئەمە بەیتی شەشەمە.

١٠- مح: دوو.

١١- مح: پۆشا.

١٢- کب: ڕۆژێکە.

دەبــێ کــاول بــێ مــوڵکی دڵ بە تــاراجی ســوپاهی غەم
هەتــا شاهنشــەهی عەشــقت لەوێــدا میســلی ســوڵتانە[١]

لە[٢] دەس بادی ســەبا چــونکە پەشــێوە[٣] نەزمــی زوڵفەینــت[٤]
منــــی تــــاڵعســــیا بــــۆیە[٥] هەمــــوو نەزمــــم پەرێشــــانە

مەکەن تیماری زەخمی[٦] جەرگــی تــاهیر ئەی تەبیــب ئــاخر!
بــزانن تــا لە حەشــرا[٧] ئەو شــەهیدی تیــری موژگــانە[٨]

---

١- لە (مح و کب)دا ئەم بەیتە نەهاتووە.

٢- کف: بە.

٣- کف: پەشێوا.

٤- مح: زوڵفەین.

٥- کب: نەمرۆ.

٦- کف: تیما زجم؛ مح: تیما زخم، هەڵەیە و دەبێت (تیماری زەخمی) بێت.

٧- مح: مەحشەردا.

٨- کب: ئەم بەیتەی نەهێناوە.

## ١١[١]

ئەی پـــرتەوی ڕەنگـــت وەکـــو ڕەنگـــی[٢] هەمەڕەنـــگە!
خاڵـــت وەکـــو زوڵفـــانی[٣] ســـیاهت، شـــەوەزەنگە

بەزمـــم تەرەبە، بـــادەیە،[٤] ســـاقی مەیـــێ فەرمـــوو
دەنگـــی دەف و نـــاڵەی نەی و ئـــاوازەیی چەنـــگە

لێـــوت کـــە وەکـــو لـــەعلی بەدەخشـــانە بە ئـــاڵی[٥]
گـــەنجوورە[٦] نیگەهبـــانی دەهـــان و دەمـــی تەنـــگە

ســـەد نـــامی خـــودا بـــێ لە دوو پســـتانی ئەنـــارت
گـــرد و شـــلک و نـــازک و پڕچنـــگ و قەشـــەنگە[٧]

تـــــابووری موژانـــــت لەگەڵ ئەگـــــریجە بەرابەر
وەســـتاوە دەڵێـــی[٨] عەســـکەری ژاپـــۆن و فەرەنـــگە

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، مح، کب) و چاپکراوەکانیشدا هاتووە. (کب) دووجار ئەم شیعرەی هێناوە. جیاوازی زۆر لەنێوان نوسخەکان و چاپەکاندا هەیە.

٢- کب: ڕەنگت.

٣- کف: خاڵت بە مەسەل زوڵفی؛ مح: کە وەکو زوڵفان، دواتر لە ژێرەوە نووسراوە (زوڵفەین) نوسخە.

٤- کب: بادەی.

٥- کف: لەعلی لەبی لێوت کە بەدەخشانە بە ئاڵی. ئێمە لەبەر ڕۆشنایی چاپی (مح) چاکمان کردەوە.

٦- کف، مح: گەنجوور و.

٧- لە (مح)دا لە دوای ئەم بەیتەوە، بەیتێک هاتووە، وەزنی نیوەبەیتی یەکەمی نارێکە. لە هی تاهیر بەگ ناچێت، وا لە پەراوێزدا دای دانێین:

ئەو دوو چاوانە بەجەنگ تاڵبن، من مائیلی سوڵحم          گـەر جەنگە و گـەر سوڵحە، دەسا فەرموو درەنگە

٨- کب: ئەڵێی.

بــۆ بــاری غــەمت گــەر بــەدەنم ســســتە مەڕەنجــە[١]
پێکـــاوی[٢] مــــوژەی تــــۆیە نەکـــوژراوی تفەنــــگە[٣]
چـــاوت بە مەســـــەل ئـــافەتی دڵهـــایە[٤] وەلێکـــــین
بــۆچ وایە کە ئەبرۆیــی کەچــت مەیلــی وە جەنــگە[٥]
سەرگەشـــتەیی عەشـــقم بە فیراقــت وەکــو فەرهـــاد[٦]
کێـــوم بەدەن[٧] و ســـینە و ســـەر، پەنـــجە قـــوڵەنگە[٨]
لەم ڕۆژە کە ڕووی خســـتە بەری پێـــی و وتـــی پـــێم:
ئەی ئەبـــڵە! کە کەی ماڵشـــی ئـــایینە بە ســـەنگە؟[٩]
مەنعی[١٠] مەکە تـاهیر کە ئەگــەر مــات و خەمۆشـە[١١]
دێـــوانەی ڕووی تـــۆیە نە مەســـتی مەی و بەنـــگە[١٢]

---

١- مح، کف: سەیدی دڵم ئەر خەستە و خوێنینە بەقوربان.

٢- مح، کف: کوژراوی.

٣- ئەم بەیتە لە (مح و کب)دا نەهاتووە.

٤- لە نوسخەکەدا نووسراوە (دڵها).

٥- ئەم بەیتە لە (مح)دا نەهاتووە؛ لە نوسخەکەدا نووسراوە (چەنگ) و هەڵەیە، دەبێت (جەنگ) بێت.

٦- کب: سەرگەشتە و ئاشوفتەی عەشقم وەکو فەرهاد.

٧- کف: بە دڵ.

٨- ئەم بەیتە لە (مح و کب)دا نەهاتووە.

٩- ئەم بەیتە لە (مح)دا نەهاتووە.

١٠- کب: مەنعم.

١١- کف: مەکە تاهیر کە بێدەنگ و خەمۆش؛ مح: مەنعی مەکە تاهیر کە ئەگەر مات و خەمۆشی، هەردووکیان ناتەواون، ئێمە ئەو شێوەی سەرەوەمان بە ڕاستتر زانی.

١٢- مح: پێکراوی موژەی تۆیە نەکوژراوی تفەنگە؛ کب: دێوانەی ڕووی تۆیە نە مەستی مەی و بەنگە.

## پرسیارێکی تاهیر بەگ لە مەلا کاکە حەمەی بێلوو (ناری)

### ١٢[١]

خـــودا عەدلـــی لەلای عـــارف عەیـــانە
بە حەقـــقەت ئـــێمە گەللـــەین، ئەو شـــوانە
لەبەرچـــی وا مەڕی خـــۆی مەردی چوپـــان
بە دەســـتی خـــۆی ئەخـــاتە بەر نیشـــانە؟

ئەگەر مـــوئمین بە حەقـــقەت دۆســـتی حەققـــن
چیـــیە حـــیکمەت دەلیلـــی ڕووســـیانە؟
مـــوقەددەر بـــوو کە گەنـــدوم بـــێ بە ڕزقـــی
لە ئـــادەم بـــۆچ ئیتـــر دەگـــرێ بەهـــانە؟

کە تیرئەنـــدازی چـــابوک دڵ بپێکـــێ
قەبـــاحەت کەی لەســـەر حەڵـــقەی کەوانە؟
کە ئەو ڕوخســـاری دڵ بێنێـــتە پێشـــۆ
نەســـیبی بولبـــولان داد و فـــەغانە

لە ڕۆژی خـــۆی عەمەل قســـمەت کـــراوە
لەبەرچـــی تـــۆ دەڵێـــی فیعلـــی خۆمـــانە؟

---

١- ئەم غەزەلە تەنها لە چاپی (حس)دا هاتووە و ئاماژەی بە دیوانی ناری چاپی کاکەی فەللاح کردووە، ئێمە دووبارە گەڕاینەوە بۆ چاپە کۆنەکە و لەگەڵ چاپە کۆنەکەیشدا بەراوردمان کردەوە.

کەوابـــــوو ئـــــاگری دۆزەخ لەبۆمـــــان
چ لازم دێ بکێشـــــــــێ وا زەبـــــــانە؟

ئەگەر خەلـــــقە لەبۆمــــان ئیختیـــــارێ
لەبەرچـــــی یەک بچـــــووک و یەک کەڵانە؟
یەکــــێ بــــۆ پارەنـــانێ جـــان فرۆشـــە
یەکــــێ حەققـــی نیـــیە، شـــاهی جیهـــانە

یەکــــێ ســــوڵتانی قەســـری زەڕنیگـــارە
یەکــــێ بێجـــێگە و بـــێ خـــان و مـــانە
یەکــێ دایــم خەریکـــی عەیــش و نۆشـــە
یەکــــێ کـــوژراوی شمشـــێری دەبـــانە

یەکــــــێ قـــــاروونی دەوڵەتهەمعینــــانە
یەکــێ موحتـــاجی ســـککەی یەک قـــڕانە[1]

### وەڵامی ناری بۆ تاهیرەبەگی جاف

ســـوئالت ئەی ســـوخەنســـەنجی زەمـــانە!
ئەساســــی عیجـــز و تەشـــویش و مەلانە

---

۱- پێدەچێت ئەم شیعرە بەیتێک یان چەند بەیتێکی کۆتاییی فەوتابێت.

حەقـــیقەت: قســـمەتی ئەحـــواڵی عـــالەم
دەلیلـــــی زەبـــــت و ئەحکـــامی نیهـــانە

کەســـێ عـــارف بە حـــوکمی پادشـــایە
کە مەحـــــرەم بــــێ بە ڕازی خوســـــرەوانە
وەلــــێ مەجبـــوورە فیکـــرم بــــۆ جەوابـــت
ئەگەرچـــــی عـــــاجزی دەوری زەمـــــانە

تەریقـــــی (لانســــلّم) بـــــا نەمێنـــــێ
نەبێــــتە بەحـــس و گـــاڵەی مـــازووانە
بەڵـــێ عەدلـــی خـــودا وەک میهـــری ئەنـــوەر
لەلای ئەهلـــی بەســـیرەت بـــێ گومـــانە

وەکـــو ســـەمع و بەســـەر، عـــیلم و حەیـــاتی
کەلامـــــی، قـــــودرەت و زاتـــــی عەیـــانە
لە بەینـــی کەســـبی عەبـــد و خەلقـــی خـــالیق
تەفـــــاوت وەک زەمـــــین تـــــا ئاســـــمانە

کە کەســـبی مەســـدەر و حوســـن و قەبـــاحەت
قەبــــاحەت وەســــفی کەســــبی عاســــییانە
خـــوا بێنەقســـــە، وەســـفی زات و خـــولقی
بە ئەحســـەن خەلـــق مەشـــهووری جیهـــانە

بەڵـــێ حەق ڕاعیـــیە، گەللــــە خەلایـــق
عیبــــــادەت ڕۆن و شــــــیر و تووکیــــــانە
پەزی بـــێ فەرو[۱] و پەشـــمە و ئەبـــڕەش[۲] و لەڕ
ســـــــزاواری ســـــــەگی یۆنانییـــــــانە

کەســـێ لادا لە جیلـــوەی حوســـنی عەشـــقی
ئەکێشـــــێ ئێشـــــی نەشـــتەر بولبـــولانە
نیـــیە نەقـــس و زەلیلـــی دەســـتی ڕووســـی
جەزای زیلـــــلەت کە قەســـری حۆرییـــانە

تەماشـــــا کە لە بـــۆ تەعلیمـــــی عیرفـــان
فەلاقەی کـــــــــورِ دەکەن ئەم ڕۆمییــــــــانە
جەهەنـــنەم بـــا لە جۆشـــا بـــێ، جەهەنـــنەم!
چە بیمـــــێ بـــــۆ گرۆهـــــی موئمینـــانە؟

بە مـــوئمین چـــی ســـەقەر، دۆزەخ، جەهەنـــنەم
مەقـــــامی ڕووســـــیان و ڕووســـــیانە

---

۱- لە هەموو چاپەکاندا نووسراوە فەرع. بێگومان فەرو ڕاستە.

۲- لە چاپەکاندا نووسراوە عەبرەش.

## ١٣[1]

بـــوتی باڵانەمـــام، ســـەروی بەهەشـــتی تەڵـــعەتە، جـــافە
لەبـــی کەوســـەر، قەدی توویـــا، ڕوخـــی وەک جەنـــنەتە، جـــافە
عەشـــیرەی بـــازێکی ئـــازایە،[2] بـــۆ شـــۆڕ و شـــەڕ و غەوغـــا
لە نـــاوچەی گیـــان و دڵـــدا وا خەریکـــی غـــارەتە، جـــافە
دەڵـــێن ئەو ئـــافەتی دیـــن و دڵ و دانـــایی و عەقـــڵە
کەوا خـــاوەن شـــکۆ و بێبـــاک و ســـاحێب شـــەوکەتە، جـــافە
بە شمشـــێری بـــرۆ و دیشـــنەی بژانگـــی[3] جەرگـــی پەی کـــردم
دیـــارە ئەی ڕەفیقـــان! دوور لە ڕەحـــم و شـــیفقەتە، جـــافە
بە ڕوومەت گوڵشـــەنی حوســـنە، بە قـــامەت نەخڵـــی ئومێـــدە
جیهـــانی عـــیففەت و شـــەرمە، ســـپیهری عیســـمەتە، جـــافە
وەکـــو شـــەعرای یەمـــانی، کـــاتی عیشـــوە، ســـارد و بێبـــاکە
ئەڵێـــی پـــاییزە نـــازی، پـــڕ لە لەرز و ســـەغڵەتە، جـــافە
نیگـــاهی دڵ دەبـــا و نەشـــئەی کەلامـــی ڕاحەتـــی جـــانە
پەیـــامی میحـــنەتئەنگێـــزە، وەڵامـــی ڕەحـــمەتە، جـــافە
تەریـــدەی ڕێـــی دڵە، جەردەی قوماشـــی شـــادی و شـــەوقە
چەپـــاوی هـــۆزی گیـــان بـــۆ ئەو هەمیشـــە عـــادەتە، جـــافە

---

١- ئەم شیعرە لە نوسخەکاندا نەبوو و لە گۆڤاری هەڵەبجە، ژ٣-٤، س١، ١٩٩٩: ١٠٣ وەرمان گرتووە.

٢- لە سەرچاوەکەدا نووسرابوو (نازێکی پارایە)، ئێمە بە هەڵەی دەزانین و پێمان وایە (بازێکی ئازایە) ڕاستە.

٣- لە چاپەکەدا بە (برژانگی) هاتووە و کێشەکەی لەنگ کردبوو. دەبێت بژانگی بووبێت کە هیچ لەنگیی تێدا نییە و هەر ئەو واتایەشی هەی؛ ئێمە ئەمەیانمان هەڵبژارد.

رەئیـــــسی مــــــاهڕوویان، ئـــــامر و ســـــەرعێڵی خووبـــــانە
ئەمیـــری مـــوڵکی عیـــزز و نـــاز و ســـام و ســـەتوەتە، جـــافە
لە باســـی حوســـنی ئەو مەهـــڕوویە تـــاهیر گێـــژ و حەیـــرانە
بەڵـــێ، شـــایانی ســـەد نەعـــت و ســـپاس و مەدحەتە، جـــافە

## پیتی یێ

١[1]

چەمەن یەکبـارە خامۆشـە، خرۆشـی بولبـولان، بـا بـێ
دڵ ئەمڕۆ مات و مەدهۆشە، خودا![2] فەسڵی گـوڵان بـا بـێ
ئەگەر مەیلت لەسـەر مـانە چ حـاجەت ئـاوی[3] حەیـوانە؟
لە لـەعلی لێـوی[4] جانـانە حەیـاتی جاویـدان، بـا بـێ

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، دک، کب) و نامەی فەرهەنگیی کوهستان و دیوانە چاپکراوەکانیشدا هاتووە. گیوی موکریانی بە هی وەفاییی زانیـوە و لە دیـوانی وەفاییـدا چـاپی کـردووە، بەڵام مامۆسـتا قـەرەداغی لە دیـوانی وەفاییـدا نەیهێناوە. ئێمە لەبەر ڕۆشناییی دوو دەسـتنووسی بەردەستماندا هێناومانە و بە شیعری تاهیر بەگی دەزانین. جیاوازیی زۆر لەنێوان نوسخە و چاپەکاندا هەیە، ئێمە تەنها نوسخەکانمان بەراورد کردووە.

لە نوسخەی (کب)دا ئەم شیعرە تێکەڵ بە غەزەلێکـی تـر کـراوە کە بەم نیـوەبەیتە دەسـت پـێ دەکـات (لە دەوری پیـری مەیخانە سەدایی موتریبان با بێ). ئەم دووغەزەلە یەک کێش و سـەروا و پاشسـەروایان هەیە. لە نوسـخەکانی (مـح و کف)دا هاتووە و لە هەردووکیاندا، جارێک بە ناوی شەهیدی و جارێکیش بە نـاوی تـاهیر بەگەوە تۆمـار کـراوە. لە ژمـارە ٥٢ی گۆڤاری بەیان (تشرینی دووەمی ١٩٧٨ز.) عەبدوڕەحمان مزووری بـابەتێکی لەم بـارەیەوە نووسـیوە و یەکلاییـی نەکردۆتەوە کە شیعرەکە هی شەهیدییە یان تاهیر بەگ. بەپێی بەدواداچوونی ئێمە و ئەو نوسخانەی دەستمان کەوتوون، شیعرەکە هی شەهیدییە نەک تاهیر بەگ. لە دەسـتنووسێکدا کە دکتۆر هێمن عومەر خۆشناو بۆی ناردووین، بە ڕوونی نووسراوە (کلام شهیدی) و شیعرەکە بە هی شـەهیدی دانـراوە. جـگە لەم بەڵـگەیە، تـاقە دەسـتنووسـێک کە شـیعرەکەی نەداوەتە پاڵ شەهیدی نوسخەی (کب)ە کە تەنها چەند بەیتێکی لێ هێناوە و لەگەڵ ئەم غەزەلەی تاهیر بەگدا تێکەڵـی کردوون. دیارە سەرچاوەی ئەم تێکەڵبوونەش لێکچوونی هەردوو شیعرەکەیە و ئەمەش بـووە بە هـۆی ئەوەی هەنـدێک لە نوسـخەکان بە نـاوی هەریەک لە تـاهیر بەگ و شـەهیدییەوە بیهێـنن. ڕوونە کە تەنهـا بـوونی چەنـد بەیتێکـی بە تێکەڵکراوی لەگەڵ غەزەلێکی تـاهیر بەگ نـابێتە بەڵـگەی ئەوەی غەزەلەکە بە هـی ئەو هەژمـار بکرێـت. لەبەر ئەم هۆکارانە، ئێمە لەم دیوانەدا ئەو غەزەلەمان نەهێنا.

٢- کف: خوا.

٣- کف، دک: ئابی.

٤- کف، دک: لە لێوی لەعلی.

نەمــاوە حــاڵەت و ژیــنم لەدەس چــوو ڕۆحــی شــیرینم
ڕەفیقان! بێن بکەن شینم سەدای گریە[١] و فەغان، با بێ
ئەســیری تــاری گێســووتم، هیلاکــی چــاوی جــادووتم
شــەهیدی تێغــی ئەبــرووتم، دەســا عیســای زەمــان، بــا بــێ
بیحەمــدیللا گــوڵی ڕەعنــا شــکاندی[٢] ڕەونەقــی لەیــلا
بڵـێن مەجنــوونەکەی شــەیدا[٣] ڕەئیــسی عاشــقان، بــا بــێ
زەمــانە[٤] بەزمــی ڕەنــدانە، بــدە ســاقی بە پەیــمانە
لەبەر تەعزیمــی مەیخــانە بڵـێن پیــری موغــان، بــا بــێ
لــە باغــان ســەیری گــوڵزارە، لــە هــەرلا عاشــقی یــارە
خــودا! ئــەو ئاهووڕەفتــارە وەکــو ســەروی ڕەوان بــا بــێ[٥]
ئەلا ئەی عاشــقی مەدهــۆش وەکــو تــاهیر مەبە خــامۆش!
لەبەر سۆزی[٦] دڵی پــڕ جــۆش، خرۆشــی[٧] موتریبــان، بــا بــێ

---

١-کب: شین.

٢-کب: شکانی.

٣-کف: شەیدو

٤-کب: زەمانی.

٥-ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی (کب)دا هاتووە.

٦-کب: سۆزەی.

٧-کف: خرۆش.

٢[1]

مــوقەددەر گەر نەبــێ ئــاخر لە میهــری مەهرِوخــانم[2] چــی؟
لە ناڵەنــاڵی نیــوەی[3] شــەو، لە ئــاهی بەربەیــانم چــی؟
نیشــانەی ئیفتیخــاری مــن لە ســینەم[4] داغــی هیجــرانە
بــرِۆ ئەی ناســیحی موشــفیق! لە رِوتــبە و یــا نیشــانم چــی؟
غەرەز وا بــوو موقابیــل کەم لەگەڵ گــوڵ رِەنگــی[5] رِوخســارت
وە گەر نــا، بــێ[6] قەدی ســەروت، لە ســەیری گوڵســتانم چــی؟
کە مــن میحرابــی ئەبــرۆی تــۆ مەقــامی[7] ســوجدەگاهم بــێ
ئیتــر وەک زاهیــدی خــودبین لە مەوعیــدی جینــانم چــی؟
شــەوم وەک رِۆژی رِوونــاکە لە شــوعلەی رِوومەتــی[8] ئاڵــت
بەڵــێ یەکبــارە ون بــێ،[9] بــا[10] لە مــاهی ئاســمانم چــی؟

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، دک، مح، نج، کب) و دیوانە چاپکراوەکانیشدا هاتووە.

٢- نج: مەهرِوانم.

٣- کف، دک، مح، کب: نیسفی؛ نج: نیوە.

٤- نج: سینەی.

٥- نج: لەگەڵ گوڵرِەنگی.

٦- لە نوسخەکانی (نج و کب)دا نووسراوە (نەبێ) و هەڵەیە؛ لە نوسخەی (مح)یشدا بەشێوەی (مابێ) و (نابێ) هـاتووە، دواتر نووسراوە: نوسخە (نەبێ)، ئێمە نابێمان هەڵبژارد، هەڵبەت رِوونە کە دەبێت بۆرێک لە نێوان نا و بێـدا هەبێـت تـا وەزن و واتاکەی رِاست دەرچێت.

٧- نج: هەمیشە.

٨- کب و کف: تەڵعەت.

٩- مح: با ون بێ.

١٠- نج: لە سەیری شەوقی سەییارە و؛ کب: ئەم (با)یەی نەهێناوە.

به نەیڕەنگــی فەلەک جانــا! لە دڵــما دەرنەچــوو[١] میهــرت
کە من یەک‌ڕەنـگ و یەک‌نەوعـم لە تەبـدیلی زەمـانم[٢] چـی؟
وتــم: بــێ ئــاڵەتی کوشــتن مەکە تــۆ قەســدی جــانی[٣] مــن[٤]
وتــی: مــن خــاوەنی[٥] غەمــزەم لە شمشــێر و کەمــانم چــی؟
لە بــازاڕی مــوحیببەت، موشــتەریی هەر نەوعە جنســێکم[٦]
بەســە! بــۆ مــن[٧] خەریــداری، لە ســوود و یــا زیــانم چــی؟[٨]
بە مــن قەت نــادرێ تەفســیری ئایــاتی ســەری کــوڵمی[٩]
گــرانە تــاهیرا! بــۆ مــن لە تەعریــف[١٠] ویەیــانم چــی؟[١١]

---

١- کب: دەرچوو.

٢- کف: جەنانم.

٣- مح: ڕووحی.

٤- نج: مەکە قەسدی حەیاتی من؛ کب: وتم بێکوشتنی ئالەت مەکە تۆ قەسدی قەتڵی من.

٥- کف، دک، مح، نج: ساحێبی.

٦- مح: جنسێکە.

٧- مح: لە بەرچاوی؛ نج: بەسە وەهمی؛ کف، دک: هەم من.

٨- لە (نج)دا ئەم بەیتە بە بەیتی ژمارە (٤) هاتووە.

٩- دک، مح، نج، کب: کوڵمت.

١٠- مح: شەرحی لە تەفسیلی.

١١- نج: مەحاڵە تاهیرا شەرحی لە تەفسیر و.

٣[١]

عیلاجـــی دەردی عەشـــقە غـــونچەیی لێـــوی شـــەکەرباری
گــوڵ و شـــەککەر دەبـــارێنێ بە حەقـــقەت نوتـــق و[٢] گوفتـــاری
فەلەک زانیـــی کە دەشـــکێ ڕەونەقـــی بـــازاڕی مانـــگ و خـــۆر
شـــکاندی پەنـــجەکەم تـــا مـــن نەنووســـم وەســـفی ڕوخســـاری
بە غەمـــزەی نـــیمنیگـــاهی ســـەد دڵـــی بێچـــارە[٣] مەحبووســـە
لە بابـــل خوێنـــدوویە[٤] ئەفســـوون دوو چـــاوی بێچووەعەییـــاری
بە شـــوعلەی شـــەمعی ڕوخســـاری دەســـووتێ دڵ وەکـــو قەقـــنەس
وتـــــم: پەروانەیە یـــــارەب! نیـــــیە وا بانـــــگ و هـــــاواری
وەکـــو یووســـف ئەگەرچـــی موشـــتەری وەســـتاوە[٥] ســـەف دەر ســـەف
وەکـــــو تـــــاهیر نیـــــیە ئەمـــــڕۆ بە گیـــــان[٦] و دڵ خەریـــــداری

١- ئەم غەزەلە تەنها لە نوسخەی (کف، کب) و چاپەکاندا هاتووە.

٢- کف: نوتقی.

٣- کف: بیمار.

٤- کب: خوێندووە.

٥- کف: وێساوە.

٦- کف: جان

٤[١]

سـەد کە شـاهی، حەز بـکەی هەر تـۆ موکافـاتم[٢] ئەکەی
مـن قسـەی حەق هەر دەکەم سـا چـۆن موجـازاتم[٣] ئەکەی!
من بە تەختـی خوسـرەو و[٤] جـامی جیهـانی[٥] گەپ دەکەم[٦]
تـــۆ بە مەئمـــووری[٧] ئیعـــانەی دۆم و خەرڕاتـــم ئەکەی
من بە سەد منـنەت لە نـوقڵی[٨] لێـوی یـاری خـۆم ئەخـۆم
تـــۆ[٩] بە شـــاگردی دووکـــانی مـــەردی قەننـــاتم ئەکەی[١٠]
مـــن ڕەزا نـــابم بە نـــانی گەنـــدومی ئادەمفەریـــب
تـــۆ بە ئومێـــدی کـــولێرەی جـــەوت و زورڕاتـــم[١١] ئەکەی

---

١- ئەم شیعرە لە نوسخەکانی (کف، نجم، کب) و چاپەکانیشدا هاتووە.

٢- نجم: موجازاتم.

٣- نجم: موکافاتم.

٤- نجم: خوسرەوی.

٥- نجم: جیهان.

٦- کف: گە دەکەم.

٧- لە نوسخەکەدا نووسراوە (مەئموور و) و هەڵەیە.

٨- کف: نەخلی.

٩- لە نوسخەکەدا نووسراوە (ئەو) و هەڵەیە، دەبێت (تۆ) بێت.

١٠- کف: دەکەی؛ لە (نجم)دا نووسراوە (ئەکەی) و دروستترە.

١١- کف: کوورەیی موجازاتم.

مــن لە شــاهی ســاحێبی فیــل و عەلەم پەروام نیــیە
تــۆ لەژێــر دەســتی پیــادە و[١] ئەســپتا مــاتم[٢] ئەکەی[٣]

(فــی المثــل) مــن (مســلم)م دەعــوای موســڵمانیم هەیە
تــۆ حەواڵەی مەســئەلەی ئینجیــل و تەوراتــم ئەکەی

نەزم و نەســری تــاهیر ئیمــڕۆ بــۆتە ئەورادی زوبــان
تــازە دێــی فێــری قەســیدە و شــیعر و ئەبیــاتم ئەکەی؟[٤]

---

١- نجم: پیادەی.

٢- نجم: ئەسپی داماتم.

٣- کف: تو لەژێر دەستی پیادەی ئەسپی تاماتم ئەکەی؛ نجم: تۆ لە ژێردەستی پیادەی ئەسپی دا ماتم ئەکەی، بەو شێوەیەی سەرەوە دروستترە.

٤- کف: دەکەی؛ نجم: ئەکەی.

٥[١]

مەریـــــووتە حەیـــــاتم بە بیـــــارە[٢] و بـــــە دیـــــاری
خـــۆزگەم بە ســـەگی قـــاپییەکەی قـــوتبی مەداری!
ئەم کـــاولە دونیـــایە و لەنەو زیـــر[٣] و زەبەر بـــێ
پـــاش[٤] ئەحـــمەدی موختـــار و ئەبـــووبەکر و ســێ یـــاری
فـــارووقی زەمـــان مونعـــەکیسی زەوئـــی ســـیراجە[٥]
عوســـمانی کومـــەڵ جـــامیعی ئەوســـافی دیـــاری[٦]
ئەم حـــوجرە کەوا تەوفگەهـــی[٧] حەزرەتـــی شـــێخە
یەکســـەر هەمـــوو ئەنـــوارە، چ ســـەقف و چ کـــەناری[٨]
ئـــەفواجی مەلـــەک دێنـــە تـــەوافی بـــە هـــەموو ئـــان[٩]
خـــاڵی نیـــیە یەک لـــەحزە،[١٠] نە حـــوجرە و نە حەســـاری

---

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (کف، دک، کب) و دیوانە چاپکراوەکاندا هاتووە، جیاوازیی لەنێوان نوسخە و چاپەکاندا هەیە.

٢- کف: بیاریم.

٣- کف: نەو ژیر.

٤- کف: لەپاش.

٥- کف: فارووقی زەمان حەزرەتی نائیبی شێخ عوسمان.

٦- کف: واسیل بە دەرگاهی کەرەم ڕەحمەتی باری.

٧- کف: ئەم حوجرەیە کە جێی تەوافگاهی.

٨- دک: چ حەساری؛ کف: یەکسەر هەموو ئەنوارە چ سەقفی وەک ڕەوزە و دیواری.

٩- کف: هەر دەم بۆ تەوافی، جەمعی مەلایک دێن.

١٠- کف، دک: ئانێ.

قوربـــانی حەســـاری کـــە نـــە ڕێگـــەی مـــن و تۆیـــە[1]
مەجمـــووعی مەلائیـــک کـــە هەمـــوو[2] بـــۆتە زەواری
حـــــاجی! وەرە ئەم قـــــاپییە گەر تـــــاڵیبی دینـــــی
ســـەد حەج و دووســـەد عـــومرە تەوافێکـــی مەزاری
ســـەد شـــوکری خـــودا لازمە بـــۆ جەمعـــی موریـــدان
خـــاڵی نیـــیە جـــێگەی، وەکـــو ئابـــائی[3] دیـــاری
ئەی نەجمی هـونەر، مەزهەری حەق، حەسـرەتی[4] خورشـید!
لازم نیـــــیە وەســـــفت، لە هەمـــــوو لاوە دیـــــاری
گەر تـــالیبی یـــاری وەرە ســـا[5] ڕوو بکـــە خورشـــید
ئەی خالیـــــدی بێچـــــارە! تـــــۆ بەم دەردە دووچـــــاری
تـــا تـــۆزی دەری قـــاپییەکەی نەیکـــەیە چـــاوت
ئەم چـــاوە کـــە چـــاوەی[6] حەســـەدە، نـــاکرێ چـــاری[7]

---

١- کف: ئەم حوجرە لە حەرەمدا تەوافی بۆ نییە.

٢- کف: هەموو.

٣- کف: وەک ئابادی.

٤- کف: حەق و مەه و.

٥- کف: یاری سا.

٦- کف: ئەم کێوە کاری حەسەدە.

٧- لە نوسخەی (کف)دا دوای ئەم بەیتە بەیتێک هاتووە لە نوسخەکانی تریدا نەهاتووە و لە ڕووی کێش و ماناوە ناتەواو بوو، ئێمە وا لێرە، لە پەراوێزدا نووسومانە: فیکرت کە ڕەیی باری حەسەد ڕێی قوڕ و شێرە// بێخاوەنە، بێڕێگە، لە شەیتانە سواری.

ئەی قافڵەسالار، تۆ ئەی ئافەتی خورشید![١]

توو مەرقەدی گەیلانی و توو پیری بوخاری![٢]

ڕەحمێ بکە بەم تاهیری[٣] بێچارە و مسکێن[٤]

مەهجوور و حەزینە دڵی بێزار و نەزاری[٥]

١- کف: ئافەتی مەه و خورشید.

٢- کف: و پیرانی بوخواری.

٣- دک: تاهیرە.

٤- دک: بێچارە کە مسکێن؛ کف: بێچارەی مسکێن.

٥- کف: مەهجووری دڵی دا لە دونیادا بێزاری.

٦[1]

ئەلا ئەی عەقڵــی کۆتــابین! هەتــا کەی مــات و دامــاوی؟
بە قەیــدی نەفســی ئەمــارە، سەراســەر بــۆچی بەســراوی؟
خەیــاڵی هــیچ و پووچــت وایە دەوڵەت هەم عەنانــت بــێ
حیســـابێکە، کە موحتـــاجی نەســـیبی دوو گەزی جـــاوی
مەســەل دونیــایە ســەییاد و ئەتــۆش مــورغێکی بێهۆشـــی
مـــوقەییەدبە بە یەک دانە هەتـــا نەتخـــاتە نـــاو داوی
زەمـــانە هەر وەکـــو قەحـــبە هەماغۆشـــی هەزارانە
چ ســـوودێکی هەیە بـــۆ تـــۆ کە ســـەردانێی لە پێنـــاوی؟
مەبەســـتە دڵ بە دونیـــا تـــاهیرا! بێســـوودە بـــۆ هەرکەس
مەحـــاڵە نـــاگیرێ[2] بـــۆ تـــۆ گـــوریز کە، ســـا لە گێـــژاوی

---

١- ئەم غەزەلە تەنیا لە نوسخەی (کب) ودیوانە چاپکراوەکاندا هاتووە.
٢- لێرەدا دەبێت (ی)یەکە بە کورتی و بە شێوەی بزرۆکە گۆ بکرێت و بخوێنرێتەوە.

## سێ پارچە شیعری گۆرانی

### ١[1]

شــەماڵ یــار نەدیــت، شــەماڵ یــار نەدیــت؟
ئــەو وەختــە ئامــای، دیــدەی یــار نەدیــت؟
ئەو دیــدەی ســەیوان پەڕ خومــار[2] نەدیــت؟
ئەو تــوڕڕەی چــینچــین ســیاتار نەدیــت؟
دڵــــدار دڵـــــبەر ســــتەمکار نەدیــــت؟
ئـــاهووی وەتەنیـــی[3] خۆشــــڕەفتار نەدیــت؟
ئەو پەنــــجەی قرمـــز حەنـــایی نەدیــت؟
ئەو نـــــوور دیــــدەی بینـــایی نەدیــت؟
گـــوڵڕووی گـــوڵچیهرەی گوڵئەنــدام نەدیــت؟
سۆســـەنی کـــڵاف، موشـــکینفـــام نەدیــت؟
لوئلـــوی ناســـوفتەی هـــیچ ئەڵـــماس نەدیــت؟
کـــان[4] یــــاقووتی بێقیــــاس نەدیـــت؟
ســــینەی ســـیم بەور پەروەردش نەدیــــت؟
غـــونچەی نەشـــکوفتەی بـــێگەردش نەدیــت؟

---

١- ئەم شیعرە لە نوسخەی (کب) ودیوانە چاپکراوەکاندا هاتووە.
٢- لێرەدا نووسراوە (خومار پەڕ) و هەڵەیە.
٣- ڕێی تێ دەچێت خوتەنی بووبێت، بەڵام دەشگونجێت مەبەستی ئاسکی خۆماڵی بووبێت.
٤- نووسراوە (کانی) و هەڵەیە.

لیمـــۆی نەورەســـەی مەمـــانش نەدێـــت؟
ئەبـرۆی سـەیفئاسـای کەمـانش نەدێـت؟
بـــالای عەرعەری، سەروئاســـا نەدێـــت؟
شـــۆخ شێوەشـــەنگ بێوەفـــا نەدێـــت؟
شـــاباز مەریـــوان، هەڵۆخـــوو نەدێـــت؟
نـــازدار خـــێلان، فیتنەجـــوو نەدێـــت؟
نەدێـــت تـــۆ بەیـــۆ بە عیشـــوە و نـــازێ؟
بپەرســـــۆ ئەحـــواڵ مـــــن لە رێـــوازێ؟
تەحقێـــق بـــۆ شـــەماڵ ئەو شـــۆخ و شـــەنگە
نە دیـــدەی شـــاباز، ئەو دڵ چـــوون ســـەنگە
هـــیچ نیـــیەن وە تەنـــگ مەیـــنەت وەردەکەش
بێقەیـــــدەن نە حـــاڵ کوشـــــتەی دەردەکەش
یاشـــا، چونکـــە یـــار بێوەفـــا و مەیـــلەن
دەروون وە بـــــادەی بێمەیلـــــی کەیـــــلەن
دایـــم گرفتـــار ئـــاهـ عوششـــاق بـــۆ
نەســـیبش دایـــم تـــاڵی فیـــراق بـــۆ
بە وێـــــنەی تـــــاهێر هەر دەردەدار بـــــۆ
دیـــدەی مەخمـــوورش دایـــم بـــیمار بـــۆ

٢[١]

شەهنشـــای مەئــوای ڕووح و دیــدە و هــۆش
حـــــوکمڕان[٢] موڵـــــک، دڵەی پەڕ نەجـــــۆش
دەلـــــــــیلەی ڕەمەی ئاهووڕەفتـــــــــاران
سەردەســـــتەی دەســـــتەی گـــرۆی[٣] نـــازاران
گوڵبـــۆی گوڵڕوخســـار، گـــوڵبەرگ ئەنـــدامە
گوڵغـــونچەی لەبـــان، گـــوڵین ژێـــر جـــامە
ســـــەرپەنجەی گـــــوڵین، وە هـــــوون ئەو دڵ
وەهـــــار ئامـــــاوە، پەیـــــدا بـــــی نەو گـــــڵ
حەیـــــــفەن وەی ڕوخســـــــار میناکـــــــارەوە
وەی بـــــــاڵای نەوتـــــــوول، وەشـــــــڕەفتارەوە
وەی تـــــوڕڕەی پـــــێچپـــــێچ، عەنبەرێـــــزەوە
وەی شـــــــیرین لەبـــــــان، شـــــــەکەرڕێزەوە
ســـــــاتێ نەوینـــــــۆن نەو بـــــــاڵات چەمەن!
عەتـــــر نەگێـــــرۆن، نە[٤] زوڵفـــــت ســـــەمەن!

١- ئەم غەزەلە لە نوسخەکانی (مح، کب) و دیوانە چاپکراوەکاندا هاتووە.

٢- کب: حوکمدار.

٣- کب: گرۆی نازک.

٤- کب: نەو.

نەرگـــــس نە حەســـــرەت ئەو دیدەمەســـــتە

چـــوون مـــن مـــەبۆ شـــێت، دێـــوانە و خەســـتە[١]

مەســـــــتانۆ خەراج، زوڵفـــــــت نە ڕەیحـــــــان

مەدەن بــــــاج وە ڕووی گوڵناریـــــــت گــــــوڵان

بــــــزانە تــــــاهێر بەســــــتەی خــــــاڵ تــــــۆ[٢]

مەســـــت نەبــــۆ[٣] وە دیـــــن دیـــــدەی کـــــاڵ تـــــۆ

---

١- ئەم نیوەبەیتە لە نوسخەی (مح)دا گرفتی تێدا بوو، بەپێی (کب) ساغمان کردەوە.

٢- لە نوسخەی (کب)دا هەردوو وشەی ڕەدیفەکەی بە (تۆن) هێناوە و هەڵەیە.

٣- کب: نەبۆن.

## ٣[١]

یـــــاران فەرهـــــادم، یـــــاران فەرهـــــادم
جانشـــــین خـــــاس، قەوم فەرهـــــادم
ئەورۆ کە فەرهـــــاد پۆشـــــان وە کەفەن
ئەرواش کەرد فیـــــدای[٢] شـــــیرین ئەرمەن
پەرســـا یەک یەک نـــام[٣] دەروون پەڕدەردان
بەد حـــاڵ ئەحـــواڵ، هەناسەســـەردان
قەیـــس و وەیـــس و مـــن وە تـــاقێق غەمبـــار
یەکســـەر تێعـــداد کەرد، ئەو ڕۆز[٤] [وە] شـــمار
وات: کـــێ بـــۆ لایەق پەی مەقـــام مـــن؟
گـــوم نەبـــۆ تـــا حەشـــر ســـەودای نـــام مـــن
مـــن کەرد گوزیـــدە پەی وارس وێـــش
ســـپەردش وە مـــن کـــاڵای ئـــێش و نـــێش

---

١- ئەم مەسنەوییە دووجار لە نوسخەی (مح)دا هاتووە، هەروەها لە نوسخەی (کب) و چاپەکانیشدا هاتووە.

٢- کب: ئەم وشەیەی نەهێناوە.

٣- کب: ناو.

٤- کب: ڕۆژ

شـــێتی[١] و مەدهۆشـــی، وێڵـــی[٢] ســـەر کێـــوان
عـــــــــەزاب[٣] دووری، دەرد بێـــــــــدەرمان
بـــێ خـــورد و خـــاو بـــێ، ســـەودای ئیشـــتیاق
ئەســـــیر[٤] هیجـــــران، زووخـــــاو فیـــــراق
نویســـــا نە دەفـــــتەر وە هـــــوون زامـــــان
یەک‌یەک پەرێ مـــن، هەرچـــی پـــێش ئامـــان
وات: یە سەرمەشـــــقەن پەی تـــــۆ بزانـــــی
ئســـمت مەشـــهوور بـــۆ فەرهـــاد ســـانی
یـــــاران فەرهـــــاد مەرد وە ناکـــــامەوە
پەرێ ئـــــاخ و داخ، مـــــن هەر مـــــامەوە
شـــەرت بـــۆ چـــوون فەرهـــاد چینـــی دەربەدەر[٥]
وێـــم کەم بە ســـەرگەرد خـــاڵان دڵـــبەر
بەڵ وێـــنەی فەرهـــاد، دێـــوانەی خودســـەر
نەجـــات بـــۆم جە دەســـت چەرخ بەدئەخـــتەر
یە تـــــــــــاهێر واتەن، دەروون پەڕ جە خەم
زامـــش جە زامـــی فەرهـــاد نیـــیەن کەم

---

١-کب: شین.
٢- مح: وێڵ.
٣- مح: عەزاو.
٤-کب: ئاگر.
٥- مح: دەروەدەر.

١[1]

فرستم هر سحر باد صبا را
که شاید آورد بوی شما[2] را
تب عشقت مزاجم را به هم زد
ز عناب لبت جویم شفا را
چه خوش ببریده خیّاط خدایی
ز ناز و عشوه بر قدت قبا را
معاذاللّٰه ز غم‌های فراقت
که بر هم می‌زند عیش و صفا را
بسان عندلیب از گل همیشه
ندیدم من ز تو جانا وفا را
خریدارم اگر یک بوسه دادی
دهم از نقد جان، دل در بها را
به وصلش کی [رسی] طاهر تو هرگز
ز سر بیرون کن آخر آن هوا را

---

١- له نوسخه‌ی (تا) وەرگیراوه.

٢- تا: شوما.

٢[١]

ای شـــهریار خوبـــان اندیشـــه کـــن ز داور
چنـــدان ز خشـــم هـــردم بیـــرون مکـــن گـــدا را
احـــرام عشـــق هرگـــز از دوش برنـــدار[م][٢]
از کـــوی کعبـــهٔ تـــو چـــون یـــافتم صـــفا را
یـــا رب بـــود کـــه یـــاران لطفـــی کننـــد روزی
احـــوال بـــی‌نوایـــان گوینـــد پادشـــا را
مجلس خوش است جانـا بـا روی دلفریبـت[٣]
یـا رب تـو دفـع فرمـا امشـب رقیـب مـا را
نبینـد[٤] از تـو ایـزد ترسـم کـه بـاز پرسـد
روزی ز سـر بـرون[٥] کـن جانـا تـو ایـن جفـا را
طاهر ز لـوح سـینه امشـب بـه اشـک دیـده
هـر نقـش بـود شسـته جـز عشـق تـو نگـارا

---

١- ئەم شیعرە تەنیا لە نوسخەی (مم)دا هاتووە و سەرەتاکەی فەوتاوە.

٢- مم: برندار.

٣- مم: دلفریب.

٤- مم: نبینند.

٥- مم: بیرون.

٣[١]

عمرهـا رفـت و نچیـدم گـل ز گلـزار[٢] شـما
دور تو چندان[٣] رقیبـان گشـته چـون خـار[٤] شـما
نرگس از بـی‌شـرمی خـود لاف مسـتی مـی‌زنـد
کـور بـادا چـون[٥] ندیـده چشـم خمّـار[٦] شـما
آتشـین رو یـا دلم چـون لاله پـر داغ غمسـت[٧]
سـوخت چـون پـروانه مـا را شـمع رخسـار شـما
شـکل ابـروی هلالـت گـر مـنجم نقـش بسـت
گـو که کـج آیـد نـدانی خـط پرگـار شـما
عقـرب زلـف کجـت خـوش خفـته بـر روی[٨] قمـر
نـیش بـر دل مـی‌زنـد گیسـوی چـون مـار شـما

١- له نوسخەی (تا و مم) وەرگیراوە.

٢- تا: گلزاری.

٣- تا: نزد تو جمع.

٤- تا:خاری.

٥- تا: گر.

٦- تا: بیمار.

٧- تا: پر داغ است و غم.

٨- تا: بالای.

صد زلیخا نقد جان در[١] کف ستانم[٢] بر درت
گرم باشد همچو یوسف بیع و بازار شما
رسم و آیین[٣] وفا من، پیشهٔ خود کرده‌ام
جور و بی‌باکی همیشه گشته اطوار شما
می‌شود روزی که دلبر پا نهد در کلبه‌ات[٤]
گر شود طالع زمانی طاهرا یار شما

١- مم: بر.

٢- مم: ستاده.

٣- تا: آین.

٤- مم: بر دیده‌ات.

٤[1]

تـــا نبیـــنم هـــیچ دردی روز هجـــران شـــما
خواهم امشب خـود کـنم یکبـاره قربـان شـما
وعـــدۀ وصـــلم بـــدادی دلبـــرا مـــن کـــی کـــنم
تکیـه بـر بـاد نسـیم و عهـد و پـیمان شـما
خال رخسـارت حجـر را از زیـارت بـاز داشـت
بـــرده آب از زمـــزم آن چـــاه زنخنـــدان شـــما
از خطـا تیـری نجسـت انـدر کـمان غـمـزه‌ات
جـای در دل کـرده جانـا نـوک پیکـان شـما
گرچه بسیارند کشته، لیـک پـیش از عـالمی
روز محـــشر مـــن بگیـــرم زود دامـــان شـــما
بـس‌کـه یوسـف روی دارم حضـرت یعقـوب را
کو که شهر ما شـده چـون شـهر کنعـان شـما
بس‌که قربـان گشـته جانـا عاشـقان افتاده‌انـد
کعبه خوانم بعد ازین من طـوف ایـوان شـما
روز بـــاغ او طلـــب بهـــر شـــفا عنـــاب لـــب
طـــاهرا زیـــن‌جـــا نبیـــنم هـــیچ درمـــان شـــما

۱- ئەم شیعرە تەنیا لە نوسخەی (مم)دا هاتووە.

